پرفرۆشترین کتێب
لە لیستی ئەمازۆن و
نیویۆرک تایمز

Farhan kurdi




برایان تریسی

# یاساکانی وتاربێژی

وەرگێرانی: سوهەیب سەعید

بۆ بردنەوە قسە بکەن

# SPEAK TO WIN

BRIAN TRACY



بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

## یاساکانی وتاربێژی

ناوی کتێب: بۆ بردنەوە قسە بکەن

نوسینی: برایان تریسی

بابەت: گەشە پێدانی خود

وەرگێڕانی: سوهەیب سەعید

دیزاین: فازیل کەڵۆسی

چاپخانە: تاران

نۆرەی چاپ: یەکەم 2018

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٤٠٠٠ دینار




له بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی( ١٦٩٩ ) ساڵی ٢٠١٨ پێدراوە.

**بۆ دەسکەوتنی بڵاوکراوەکانی ناوەندی سایە بەتاکو کۆ..**

ناونیشان: سلێمانی - شەقامی پیرەمێرد

Emil: saya.book@yahoo.com 07512460583

## پێرست





## پێشەکی
# بۆ بردنەوە قسەبکەن

چیارەنوسی ئێمە بە بیرکردنەوەی ئێمەوە دەگۆرێت. دەتوانین بگەین بەو ئامانجەی دەمانەوێت. دەتوانین ئەوکارەی کە حەزمان پێیەتی جێبەجێی بکەین. پێویستە بیرۆکە عادەت پێ کراوەکانمان لەگەڵ مەیلەکانمان هاوشێوە بن.

شارەزایی ئێوە لە قسەکردن و وتاربێژی کاریگەری دەبێت لەسەرکەوتنەکەتاندا جوان قسەکردن دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەوروبەر زیاتر رێزتان لێ بگرن، بەهای ئێوە بۆ بەشداری کردنتان زیاتر دەکات، ئەو کەسانەی کە دەتوانن هاوکاریتان بکەن دەرگاکان بە رووی ئێوە والا بکەن، سەرنجی بۆچوونی ڕازیبونیان بۆلای ئێوە ڕادەکێشێت، توانایی جوان قسەکردن دەوروبەر رازی دەکات، کە ئێوە مرۆڤێکی زیرەکترن لە کەسانی دەوروبەر کە ناتوانن بە باشی وەك ئێوە قسە بکەن، گەورەترین و بە بەهاترین بونی ئێوە چی‌یە؟ مێشکتان، یەکێکەو بەبەهاترینە ئەو تواناییانەی کە هەتانە، توانای باش بیرکردنەوە نیشاندانی رێگەی ڕاستی خۆتانە ئەم شارەزاییە دەتوانێت هاوکاری ئێوە بکات تا بەشداریەکانتان زیاتر بێت تا خێراتر پلەو پایە بەدەست بێنن. بەهەر شێوەیەك تەنها رێگەیەك کە دەتوانن لەسەری بەردەوام بن بابەتێك بیشان بدات دەربڕینی بیرۆکە و پێشنیارەکانتان بە دەنگی بەرز و نوسینەوەیەتی. کاتێك بە باشی قسەدەکەن خەڵکی دەڵێن ئەو (( لە ڕاستیدا دەزانیت کە لەبارەی چی بابەتێکەوە قسە دەکات )). هەواڵی خۆش ئەمەیە کە

مێشکی ئێوە وەك بازوو ئەمێنێت هەرچەندە زیاتر بەکاری بهێنن بەهێزترو بەتواناتر ئەبێت، ئەو بەشەی بیرۆکەو ڕستەکان بە وشیاری و وریایی ئێوە زیاد دەکات بەم جۆرە زیاتر تێدەگەن کەچی دەڵێن و قسەکانمان بە چی شێوازێك دەردەبڕین. دەست کردن بە خشتە دانان و ڕێك خستن وگفتوگۆکردن، ئێوە وابەستە دەکات کە مێشکی خۆتان لە شیرینی گەورەتر و بەرزتر بەکاربهێنن و زیرەکتر دەرکەون، بەسەر ترسی خۆتاندا زاڵبن و لە کارەکانتان بە سەرکەوتنی گەورە بگەن، چەند ساڵ پێش کۆنگرەیەکی یەك ڕۆژیم لە بواری کارتێکردن و بۆ بەڕێوبەرانی پلە و پایە بەرزی بازرگانی بەڕێوەبرد، لە قسەکانمدا بە بەهایی توانایی ڕێك قسەکردن و کارتێکردن بۆ ئەو کەسانەی کە لە بواری بازرگانیدا کاردەکەن ئاماژەم پێ کرد.

لە کۆتایی ڕۆژەکەدا بازرگانێکی تا ڕادەیەك شەرمەزار هاتە لام بە منی وت کەوتومەتە ژێر کاریگەری قسەکانت ئەو بڕیارەی داوە فێری وتاردان ببێت ئەو لەوەی سەرپەرشتیارەکانی گرنگیان بە قسەکانی نەدەدا ماندوو بووبو، گرنگیان پێ نەدەدا.

ساڵێ لەمەو پێش نامەیەکم لەوەوە بۆ هات کە لەنامەکەدا باسی ژیانی خۆی تێدا کردبوو، ئەو بە پەلە بەپێی ئەو بڕیارەی کە دایبوی کاردانەوەی پیشان دا، لە کۆڕی هەفتانەدا بەژداری کردبوو. لە هەریەکێك لەم کۆڕانەدا هەرتاکێك دەبوو لە بارەی بابەتێکەوە قسە بکات. وەلەکۆتایی کۆڕەکەدا بە هەر یەکێك لە بەشدار بووان دیاری دەدرایە و کۆڕانەی کە ئەو بەشداری کردبوو، شێوازێکی ڕێکوپێکیان بەکار دەهێنا، واتاکەی ئەوەیە کە ئەگەر ئیشێك چەند جار دووبارە بکەنەوە،

دوودڵیەکەیان نامێنێت. کاتێك چەند جار بۆ چەند کەسێك ووتار دەدەن، لە کۆتایدا ترستان نامێنێت. لە دەورەیەکی ١٤ هەفتەیدا بەشداری کردبوو. ئەو دەبوو لەهەر کۆڕێکدا بۆ دەوروبەرەکانی قسە بکات. لەماوەی شەش مانگدا ئەوەندە بۆ کۆمەڵەی جۆراو جۆر قسەی کردبوو کە ترسی لە وتاردان بەتەواوی نەمابوو.

دەرگاکان بە ڕوتاندا دەکرێنەوە لەم بەشەدا گەشەکردنێك بوو کە بارو دۆخێکی ناچیاری لە ڕێکخراوێکی موهەندیسی داوە پیش هاتبوو. یەکێك لە کرێکارەکان وا بڕیار بوو بۆ یەکێك لەکۆمپانیا موشتەریەکانی لە بوارێکدا قسە بکات، بەڵام ئەم کەسە نەخۆش کەوتبوو وە ئێستا سەرۆکی کۆمپانیاکە لەو بازرگانەی کە من ئامازەم پێ کردبوو داوایی کرد خۆی بۆ ئەم وتاردانە ئامادە بکات، ئەویش ئەم ئەرکەی پەسەند کرد. ئەویش بە درێژایی شەو خۆی بۆ ئەم وتاردانە ئامادە کرد بەیانی ڕۆژی دوایی ڕۆشتە ژووری موشتەری وە بەرهەمی کۆمپانیاکەی بە شێوەیەکی زۆر باش خستە ڕوو وە سەرکەوتوانە جێبەجێی کرد، کاتێك کە گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی، سەرۆکی کۆمپانیاکە ئەوی بانگ کرد و ووتی بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە کە ئەو لەوێدا بەرهەرمی کۆمپانیاکەی دەرخستوە، تەلەفۆنی کردو لەوەی کە کارمەندێکی شیاوی بۆ کۆمپانیاکەی ناردووە سوپاس گوزاربوو، لەماوەی چەند هەفتەیەکدا ئەویان بە شێوەیەکی ڕێك و پێك بۆ کۆمپانیاو ڕێکخراوە جۆر بەجۆرەکان دەنارد تا لەبارەی بەرهەمەکانی کۆمپانیاکەوە قسە بکات. ئەو دووبارە هەنگاو بە هەنگاو پلەی وەرگرت و زۆری نەبرد بو بە یەکێك لە بەڕێوەبەرانی گەورەی کۆمپانیاکەی، وە بە منی گوت ویستویەتی ببێت بە وتاربێژێکی باش هەموو ژیانی ئەو گۆڕا.

## بەسەر نەفسی خۆتاندا زاڵ بن:

بوون بە ووتاربێژێکی باش کاریگەرییەکی باش بەسەر هەموو ئیشەکاندا جێ دەهێڵێت. بەڵام هۆکارێکی گرنگتریش بۆ باش قسەکردن لە بەرامبەر کۆمەڵگەدا هەیە. دەروونناسان بەئێمە دەڵێن گەورەی نەفسی ئێوە واتە ئەمە. تاچی ڕادەیەك خۆتان خۆشبوێت، گەشبین تروو دڵنیا تر دەبن هەرچەندە زیاتر خۆتان خۆشبوێت پەیوندیتان لەگەڵ دەوروبەر باشتر دەبێت هەرچەندە زیاتر خۆتان خۆشبوێت سالم تروو دڵخۆشترو باشتر دەبن.

### وێنەی مێشکی خۆتان باشتر بکەن:

کاتێك فێری باش قسەکردن دەبن، وێنەی مێشکی ئێوە باشتر دەبێت و وێنەی مێشکی ئێوە ((ئاوێنەی ناختانە)). ئەم شێوازە شێوازێکە کەخۆتان تێیدا دەبیننەوە و بیری لێدەکەنەوە. هەرچەندە وێنەی مێشکی ئێوە باشتر ببێت. کارو کردەوەکانتان باشتر دەبێت. هەر ئەوەندەی پێش هەر پلان دانانو دەست پێکردنێك خۆتان ببینن لە بوارێکی باشدا دەرکەوتوون. کارو کردەوکانتان باشتر دەبێت.

ئێمە بە بیرۆکەکان، وهەستەکان، وە بەتایبەتی ڕێزگرتن لە دەوروبەر زۆر هەستیارین سامرست موام دەنوسێت:((هەر ئیشێك کەلە ژیانماندا دەیکەین، بۆ بدەست هێنانی ڕێزی دەوروبەرمانە وە لەکۆتایشدا نامانەوێت ئەو ڕێزەی کە پێشتر بۆیان دادەناین و ڕێزیان لێدەگرتین لە دەستی بدەین)). کەواتە کاتێك بەباشی قسە دەکەن، ئەو کەسانەی کەلە کۆڕەکەتاندا دانیشتون، ئێوەیان زیاتر خۆش دەوێت و ڕێزی زیاترتان لێ دەگرن. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئێوەلە ئەنجامدا خۆتان زیاتر

خـۆش بوێـت وهەسـت بەتوانایـەکی زیـاتر دەکـەن. بەباوڕبـەخۆبونێکی زۆرەوە هەڵسوکوت دەکەن.

## باش قسەکردن فێربوونە:

لەوانەیـە باشـترین هـەواڵ لـەبارەی قسـەکردنەوە بـۆ کۆمەڵـە کەسـانێك ئەمەبێت کە ئەمە شارەزاییەکی فێربوونە. زۆربەی ئەو کەسانەی کەئێستا وتـاردەرێکی باشـن زەمانێـك لەبـەر ترسـیان نـەیان وێـراوە قسـەبکەن. زۆربەی ئەو کەسانەی کە لە کۆمەڵەکاندا بەباشی قسە دەکەن، لەوەی کە لە بەرامبەر کۆمەڵە کەسانێکدا ڕاوەستابوون بۆ ئەوەی قسەبکەن هـەموو ئەندامەکانی جەستەیان دەلەرزا.

ئامـانجی ئێـوە دبێـت ئـەوە بێـت بگەنـەوە بـە لەسـەدا دەی کەسـە سەرکوتووەکان. ئەمەش بزانن هەموو ئەو کەسانەی کە ئـەمڕۆ لـە ٪ ١٠ی کەسە سەرکەوتوەکانن، سەردەمێك لە کۆتـای ڕیزەکانـەوە بـوون. هـەموو ئەو کەسانەی کە ئـەمڕۆ بەباشـی وتـار دەدەن، سـەردەمانێك وتاربێـژێکی خراپ بوون. ئێوە بەدڵنیایەوە دەبێت ئـەم قسـەتان بیسـتبێت ڕاهێنـان و مەشق کردن مـرۆڤ بـە لوتکـە دەگەیـەنێت وە هەنـدێ کـەس زیـاتر هـەوڵ دەدەن و هەنگاو دەنێن و دەڵێن ڕاهێنانی زۆربـاش مـرۆڤ باشـتر دەکـات. بەڵام ڕاستیەکەش ئەمەیە کـە ئەگـەر مەشـقەکە زۆر باشـیش نـەبێت مـرۆڤ هەر سودی لێ وەردەگرێت و پێی بەهێز دەبێت،

ئـەو ڕێگـاو سـەفەرەی کـە مرۆڤانێـك دەیـبڕن بـۆ گەشـتن بـە هونـەری قسەکردن، مـرۆڤ تووشـی هەڵـەی جۆراوجـۆر دەکـات. زۆرجـار وا هەست دەکەن کەشیاو نـین. وە ئـەم پرسیارەشـیان بـۆ دێتـە پێشـەوە کە ئایا ڕۆژێك بێت لەم ئیشەدا سەرکەوتوو بن.

### لەشوێنە ئاسودەکەتاندا بێنە دەرەوە:

بۆ گەشتن بە پلەیەکی باشی قسەکردن لە هەر بوارێکدا، دەبێت بتوانن لە شوێنە ئاسودەکەی خۆتان بێنە دەرەوەو هەنگاو بۆ شوێنە مەتسیدارەکان وبنێن. ئەگەر دەتانەوێت بە پلەیەکی باش بگەن، دەبێت تەحەمولی کێشەکانیش بکەن.

لەوانەیە چیرۆکی وتاردەری گەورە یونانی کۆنی دموستنس تان لەبیر بێت. کاتێك دەستی بە وتاردان کرد کێشەی زۆری بۆ دەهاتە پێشەوە لەو کێشانەش وەك تورەبوون و شەرمنی وە لەکاتی قسە کردنیشدا زمانی گیردەبوو، کێشەی قسەکردنیشی هەبوو. بەلام ئەو لەوە دلنیا بوو کە دەبێت بە وتاردەرێکی باش. ئەو بۆ زاڵ بوون بەسەر کێشەکانیدا هەموو رۆژێ دەچیوو بۆلای دەریا و بۆماوەی چەند کاتژمێرێك بۆ دەریاکە قسەی دەکرد. وە زۆری نەبرد توانی بەسەر کێشەی گیربوونی زمانیدا سەربکەوێت. وە هەروەها توانی بەسەر ئەو کێشانەدا زاڵ ببێت کە لەکاتی وتارداندا روو بەرووی دەبویەوە. ناوبانگی کەم کەم پەیدا کردوو توانای پشت بەستن وباوەڕ بەخۆ بوونی زیادی کرد، بوو بەگەورەترین وتاربێژەکانی مێژوو.

ئەگەر ئێوە سەرەتای وتاردانتانە، ئەم کتێبە رێگەو شێوازی چۆنیەتی قسەکردنتان پێ نیشان دەدات. وە ئەگەر وتاردەرێکی بەئەزمونیشن ئەم کتێبە ئێوە بەشێوازێکی بەهێزو تازە دەناسێنێت.

### چوار خاڵ بۆ ئەوەی ببنە وتاربێژێکی باش:

بۆ ئەوەی ببنە وتاربێژی باش دەبێت پەیرەوی ئەم چوار خاڵە گرنگە بن



١_ حەزوو ئارەزو: پێش هەمو شتێك دەەبێت زۆر حەزتان لەباش قسەكردن هەبێت. ئەگەر حەزێكی تارادەیەك بەتواناتان هەبێت هەولێكی باش بدەن بۆ گەشتن بە ئامانجەكەتان كە ئەویش قسەكردنە، ئەوا هیچی هۆكارێك ناتوانێت ڕێگری لە ئێوە بكات و بتان وەستێنێت.

٢_ بڕیار: دەبێت لە ئەمڕۆوە بڕیار بدەن كەموو هەولەكانتان دەدەن بۆ ئەوەی بەسەر هەموو كۆسپەكاندا سەربكەون و بۆ باشتر بوون هەرئێشێك كە پێویست بێت بیكەن.

٣_ ڕێكوپێكی: دەبێت ڕێكوپێكیەكی باشتان هەبێت بۆ پلان دانان و ڕێكخستن و ڕەخنەگرتن لە هەر وتاردەرێك بۆ ئەوەی بگەنە ئاستێكی باش.

٤_ مەبەستی دیاریكراو: لەئەنجامدا پێویستتان بە مەبەستێكی دیاریكراو هەیە تا بگەن بەو ئاستەی كە دەتانەوێت.

تەنیا سنور ئێوەن: گەورەترین دوژمنانی ئێمە دوودڵیو ترسی خۆمانە. بەلأم سنورێك بۆ ئەوەی كە بتوانین چی بكەین نییە.

لەسالأنی ڕابردوودا زیاتر لە ٤٠٠٠ وتارم بۆ ٥٠٠٠، ٠٠٠ كەس لە ٤٦ ولأتدا داوە. لە لأپەڕەكانی دواتردا هەنگاو بە هەنگاو نیشانم داون كە چۆن ئازای وپشت بەخۆ بەستن بدۆزنەوە بۆ ئەوەی لە هەر بارودۆخێكدا وتاردەرێكی سەركەوتوو بن

بـەشـی یـەکـەم



# هـــونـــەری وتـــاربیـــژی و هـــونـــەری نوسیـــن

هەموو وتارەکانی ئەو بۆ ئەوە بوو بەشێوەیەکی زانستی کاریگەرییەکی باش بەجێبهێڵێت. ئەو هەرگیز بۆ ئەوەی ناوبانگ پەیدا بکات وتاری نەدەدا.

"سپاسی سیاسەتمەدارێك بۆ هونەری گشتی".

بۆ نمونە کاتێك دموستنس وتاری دا خەڵکی گوتیـان ((چـی وتـاردەرێکی باشە)). بەڵام کاتێك ئلسی پیادس دەستی کرد بـە قسـە کـردن خـەڵکی گوتیان وەرن بابڕۆین، کەواتە ئـەرکی ئێـوە وەك وتـار بێـژێك ئەوەیـە کـە بیسـەرانی خۆتـان فێربکـەن و، بیـان خەنـە ژێـر کاریگـەری قسـەکانتان و بیرکردنەوەکانتانەوە.

دەبێت بە شێوەیەك دەست پێ بکەن کە ئامانجتان هاندانی ئەوان بێت بۆ ئـەوەی بـەرو پێشـەوە بـڕۆن. خۆشبەختانە ئەگـەر بتـەوێت ببیـت بـە وتاربێژێکی شـارەزاوو لێهـاتوو دەبێـت خـۆت فێـر بکـەیت، ئەگـەر بتـوانن خۆتان فێری شۆفێری بکەن، وئەگەر بتـوانن چـاپ بکـەن و یـا موبایلێـك بەکاربهێنن، ئەوا دەتوانن ببنە وتار بێژێکی سـەرکەوتوو، نـەك تـەنیا هـەر بۆخۆتان بەڵکو دەبێت کاریگەریشتان هەبێت لەسەر بیسەران.

## سێ بەشی گرنگ بۆ ڕازی کردن:

ئەرستۆ فەیلەسوفی گەورە کە هونەری نوسینی وەك شتێکی پێویست بۆ ڕێنمای کردن دۆزییەوە. وە ئەو شتە پێویستیەکانی بۆ سێ بەش دابەش کرد کە ئەوانیش بریتین لەمانە:لوگوس (شوێن)، ئیتوس (ئەخلاق)، پاتوس (هەستەکان) بوار بدەن لەبارەی ئەم سێ بەشەوە درێژە باسێك بکەین.

یەکەم بەش: لوگوس ئامارەی بە شوێن داوە، ووشەکان باسەکە دەسەلمێنن. ئەو قسانەی کە دەیکەن دەبێت پەیوەندییان بەیەکەوە هەبێت. وەك چۆن ئەڵقەی زنجیرێك بەستراون بەیەکەوە. دەبێت قسەکانی ئێوەش ئاوابێت. واتە دەبێت ئەو باسەی ئێوە واتایەکی هەبێت، کاتێك باش بیردەکەنەوە و پلان بۆ قسەکانتان دادەنێن و خاڵە جۆراوجۆرەکان ڕێك دەکەن تا بابەتێك دەست پێ بکەن وە بە کۆتای بگەیەنن. هەر خاڵێك دەبێتە ڕاگرێك بۆ خاڵی پێشوتری بۆ ئەوەی باسێکی ڕازی کەرانە دروست ببێت.

دووەم بەش: ئتوسە کەپەیوەندی بە سروشتیەوە هەیە ئەخلاق و باوڕەکانی ئێوە لەکاتی وتاردانادا دروست دەبێت، بەزۆر بونی وزەی خۆتان لای بیسەرەکانتان، پێش وتاردان و لەکاتی وتارداندا، بۆ ئەوەی کەبیسەرەکانتان باوڕی پێبکەن و ئامۆژگاریەکانی ئێوە جێ بەجێبکەن زیادی دەکەن.

سێیەم بەش: ڕازی بوونی پاتوسە کە ناوبراو بەسۆزەوە قسەکانتان وەردەگرێت و لەوانەیە لە بەشەکانی تر گرنگتر بێت. کاتێك کە هەست و سۆز دروست دەکەن دەبێت کاریگەر بن لەسەر خەڵکی، دەتوانن وزە بە

خەڵکی بدەن کە بیرۆکەکانیان بگۆڕن و دەست پێکردنێکی باشیان هەبێت. ئەگەر دەتوانن هەستی خەڵکی بجولێنن و کاریگەریتان هەبێت لەسەریان ئەم سێ مادە دەبێت جێ بەجێبکەن.

## سێ بەشی هەواڵ یان مەبەستی ئێوە:

ئەلبێرت محرابیان مامۆستای زانکۆی کالیفۆرنیا لە لوس ئەنجلوس، چەند ساڵ لەمەوپێش لەسەر پەیوەنیەکی کاریگەر خوێندنەوەی هەبوو. ئەو بەم ئەنجامە گەشت کەهەر هەواڵێك لە سێ بەش پێك دێت: ووشەکان، ئاوازی دەنگ، زمان و جەستەی وتاردەر.

**ووشەکان:**

محرابیان دەڵێت ووشەکان تەنیا لە٧٪ ی هەواڵەکان تایبەت دەکەن بە خۆیانەوە. ئەڵبەتە ئەو ووشانەی کە بەکاری دێنن بەهایەکی زۆریان هەیە و دەبێت لە هەڵبژاردنی ئەواندا سەرنجێکی تەواو بدەن. دەبێت زنجیرەیەکی ڕێکخراویان هەبێت و لەڕووی یاسای زمانیشەوە ڕاست و بێ کەموکوڕی بن. ئێمە گوێمان بۆ زۆر لە قسەکانی مامۆستاکان گرتوە کە ووشەی زۆر باش و کەم وێنەیان بەکار هێناوە، بەم حاڵەیشەوە لە بیستنی قسەکانیان ماندوو بووین، بۆیە ووشەکان بەتەنیا بەس نین.

**ئاوازی دەنگ:**

دووەمین بەش کە پەیوەندی بە شانۆوە هەیەو ئاماژەی پێکردووە ئاوازی دەنگە. لەژماردنی ئەودا، لەصەدا ٣٨٪ ی هەواڵ یان مەبەست لە ئاوازی دەنگدا پوختە دەبێتەوە. گرنگ دڵنیابونێکە یان تەئکیدیەکە کە دەیخەینە سەر ووشەکان.

بۆ نمونە بە ڕستەی ((تۆم زۆر خۆشدەوێت)) سەرنج بدە. بەدڵنیا بوون لەسەر ئەم ووشانە یان بە پرسیاری کردنی ڕستەکە دەتوانن مانای دەستەواژەکە بگۆڕن. هەر پیاوێکی بە ئەزموون لەسەر بابەتێکی سادە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا قسەی کردوە. پیاوان وشەی بەکار هاتوو دەردەبڕن بەلاَم ژنان هەوڵ دەدەن کۆمەڵە وشەیەك بەکاربهێنن کە پەیوەندی دروست بکەن. لەبەر ئەمەیە هەر ووشەیەك بەشێوازێکی جۆراو جۆر دەبیستن. بۆنمونە بۆی هەیە ژن لەو قسەیەی کە پیاوەکەی کردوویەتی عاجز بێت و پیاو لەوانەیە بڵێت: ((بەلاَم من تەنها ئەمەم وت)). ژن لەوانەیە بە تووڕەییەوە بڵێت:((گرنگ نییە چیت وت، گرنگ ئەوەیە کە چۆن وتت)). بەگۆڕانی ئاوازی دەنگتان بە ئەنقەستی وە بە ئاگاو هاتنەوە لەگرنگی ئەو، دەتوانن هەموو هەواڵەکان بگۆڕن و کاریگەری جۆراوجۆر بخەنە سەر بیسەران.

جسم و جەستە:

لەسەر شانۆ بەم دەرئەنجام گەشت کە لە ٥٥٪ ی هەواڵ پەیوەندی بە زمانی جەستەوە هەیە. هۆکارەکەشی ئەمەیە کە ژمارەی ئەو دەمارانەی کە لە چاوەوە بە مێشك دەگات، ٢٢ ئەوەندەی ئەو دەمارانەیە کە لە گوێوە بە مێشك دەگات. لەبەر ئەم هۆکارەیە کە کاریگەری بینین زۆر زیاترە.

ئاگاداری شێوازی پەیوەندی خۆتان بن:

پەیوەندی دامەزرێنەرە باشەکان بەوەی کە زمانی جەستەی ئەوان چی کاریگەریەکی لەبارەی ڕاستی هەواڵی ئەوان بەجێ دێڵێت سەرنج زیاد دەدەن.

کاتێك دەستەکانتان بەشێوەیەکی ئازادانە لە هەردوو لای جەستەتانەوە هەڵواسراون، کاتێ کە لەپی دەستتان بۆ سەرەوە کراوەیە وئێوە بە زەردەخەنەیەك لەکاتی قسەکردندان بۆ ئامادەبوان وسەیری ئەوان دەکەن. بیسەران هەست بە ئارامی دەکەن. هەروەك چۆن ئسفەنجێك بەئاسانی ئاو هەڵدەمژێت، ئەوانیش ئاوا بەئاسانی لە بابەتەکانی ئێوە تێ دەگەن و بابەتەکان وەر دەگرن. بەڵام ئەگەر شێوەو ڕووتان توڕەو جدی بێت، وە ئەگەر دەستەکانتان بەشێوەی کەڕەتی دابنێن و بە دەستەکانتان لێواری مێزی وتاردانەکە بگرن، بیسەران وابیردەکەنەوە کە دایك و باوکێکی توڕە قسەیان لەگەڵدا بکەن، بەم جۆرە خانەکانی مێشکیان بەڕووی ئێوەدا دەبەستن و، حاڵەتی پارێزراوانە وەردەگرن، و لەبەرامبەر پەیامەکەتاندا بەرگری دەکەن، و زۆر بەسادەییانە ڕازی نین لەو قسانەی کە دەیکەن. زمانی جەستە بابەتێکی زۆر گرنگە!

لەو شوێنانەی کە بۆ کۆمەڵە جۆراو جۆرەکاندا وتارم داوە، وتاربێژان بەردەوام داوام لێ دەکەن کە بۆچونەکانم لەبارەی وتارەکانی ئەوانەوە بڵێم لە سیمینارەکاندا. من حەز ناکەم کاردانەوەی خراپم هەبێت بەرامبەریان چونکە وادەردەکەوێت کە کەسەکان بەو بۆچوونانەی کە باش نەبن بەزۆری کاردانەوەی خراپ نیشان دەدەن. بەم حاڵەسەرسوڕهێنەرەوە کە لە زۆربەی کاتدا من بەبابەتێك ئاماژە پێ دەکەم. ((لەسەر خۆ قسە بکەن، خێرای ووشەکانتان کەم بکەنەوە، تۆزێ بێدەنگ بن و لەنێوان ڕستەکانتاندا زەردەخەنەیەك بکەن. ))

بەڕاستی ئەوانەی کە ئامۆژگارییەکانی من جێ بەجێدەکەن، تێبینی جیاواز شیاوی کاردانەوەیە کە ئامادەبوان لە کۆڕدا دەبینن. کاتێ خێرای

قسەکردن کەم دەکەنەوە، ووشەکانی ئێوە ڕوون تر دەبن، وە ئێوە هێواش تر قسە دەکەن. کەئاوازی دەنگتان ڕوون ترو خۆشتر دەبێت، کاتێك پێ دەکەنن، ئێوە بەگرو تینێکی جیاوازترەوە دەردەکەون، ئەم داخوازییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بیسەرانی ئێوە ئارام بگرن. وە پەیامی ئێوە باشتر وەربگرن. لەبەشی هەشتەمدا زیاتر لەم بارەیەوە قسەم کردووە.

## پێکهاتەیەکی سادە بۆ قسەکردنی کورت:

پێکهاتەیەکی سادە سێ بەشی هەیە کە دەتوانن بەکاری بهێنن بۆ بنیادنانی قسەکانتان. دەتوانن ئەم نمونانە بەکار بهێنن بۆ یەك خولەك یان ٣٠ خولەك قسەکردن.

## بەشی یەکەم:

بەشی یەکەم دەست پێ کردنی قسەیە. لەم بەشەدا بە ئامادەبوان لە کۆڕەکەدا دەوترێت کەدەتانەوێت لە بارەی چی بابەتێکەوە قسە بکەم. بۆ نمونە دەتوانن بڵێن:((لەوەی کە هاتون بۆ ئەم کۆڕە سپاس گوزارم. دەمەوێت لە چەند خولەکێکدا لە بارەی سێ شتەوە ڕون کردنەوە تا بدەمێ کە پیشەی ئێمە ئەمڕۆ ڕوبەڕوی بوەتەوە. دوای ئەوە ڕونی دەکەمەوە کە دەتوانم چیتان بۆ بکەم، تا بارودۆخی ئێمە لە مانگەکانی داهاتودا باشتر ببێت. ))

بەم شێوەیە بیسەران بۆ بیستنی قسەکانتان ئامادە دەبن.

## بەشی دووەم:

لەم بەشەدا ئەوەی کە لە بەشی یەکدا بەڵێنتان دا باسی بکەن. ئەمە دەتوانێت هەڵگری یەك، دوو یا سێ خاڵ بێت، ئەگەر وتاردانەکە کورتە، دەبێت لە سێ بەش پێك بێت. بۆ نمونە دەتوانین بڵێین ئێمە بە زیاد کردنی پێش برکێ، کەم کردنەوەی ڕادەی سود وگۆڕانی سەلیقەی کڕیا بوینەتەوە. مۆڵەت بدەن بەڕێکوپێکی سەیری هەر یەکێك لەمانە بکەین.

## بەشی سێیەم:

سێیەمین بەشی باسەکە، پوختەکردنی بابەتێکە کە تا چەند چرکەیەك لەمەو پێش لە کۆڕەکەدا بۆ ئامادەبوان باستان کردووە. هەرگیز نابێت چاوەڕوان بن کە بیسەرانی ئێوە ئەوەی بۆ یەکەم جار پێیان دەڵێن وەری گرن.

لەم ڕووەوە بەگەرانەوە بۆ دواوە و پوختە کردنی بابەتە گرنگەکان بۆ بیسەرانی ئێوە زۆر سەرنج ڕاکێشە.

بەکورتی بە زیاد کردنی پێشبرکێ دەبێت باشی شت ومەك و خێرا دانەوەیان زیاد بکەین، لەبارەی کەم کردنەوەی ڕێژەی سوود دەبێت بۆ بازارە نوێیەکان بڕۆین و هەوڵ بدەین کڕیاری نوێ پەیدا بکەین، بۆ گۆڕانی سەلیقەی کڕیارەکان دەبێت شت ومەکێکی نوێ بەدڵی ئەوان بەرهەم بهێنین، نەك ئەو شت ومەکانەی کە لە ڕابردوودا دەیانویست. ئەگەر بەڵێندەرانەپەیوەست بین بەم سێ ئامانجەمانەوە، نەك تەنیا پارێزگاری لە ئیشەکەمان بکەین بەڵکو داهاتویەکی ڕوناکتر چاوەڕێمان دەکات.

## ئیشێکتان هەیە کە دەبێت جێ بەجێیبکەن:

(پگی نونان) نوسەری دەقی وتاردەرانی (ڕۆناڵد ریگان) سەردەمانێك نوسی: ((هەر وتاربێژێك کارێکی هەیە کە دەبێت جێ بەجێی بکات. ))

یەکێك لە گرنگترین ئیشەکان کە پێش وتاردان دەبێت. بیکەین ئەمەیە کە ئەو ئەنجامەی کە لای خۆتان پەسەندە لە مێشکتاندا بیپارێزن. دیاری بکەن کە وتاردانی ئێوە دەیەوێت بەچی ئامانجێك بگات. لە خۆتان بپرسن کە من ((هاوشێوەی ئەو پرسیارە))

دەڵێم: ((ئەگەر دوای قسەکردنەکەم چاوپێکەوتن لەگەڵ بەشدار بوانی کۆڕی وتاردانەکە بکەن وە بپرسن کەلەم وتاردانەدا چیتان دەسکەوت؟ وە ئێستا چی گۆڕانکارییەك لە ئیشەکەتاندا دەکەن؟ دەمەوێت ئەوان چی وەڵامێك بدەنەوە؟ )) تەواوی بەشی باسەکەی ئێوە دەبێت بیسەرەکانتان بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارەکە ئامادە بکات.

کاتێك من لەگەڵ کرێکارەکاندا لە کۆمپانیایەك ئیش دەکەم، پرسیار دەکەم لەوان دەپرسم دەیانەوێت باسی چی بابەتێکیان بۆ بکەم. وتاردەرەکان بە من دەڵێن بیسەران چی بابەتێك بزانن وە دوای تەواو بونی سیمینار چی هەستێکیان دەبێت. کاتێك ئەم بابەتە ڕوون بویەوە، من سیمینارەکە دەست پێ دەکەم.

## پێکهاتەیەکی ئاڵۆز بۆ وتاردانێکی درێژ:

لەدروست کردنی وتارە درێژەکاندا، دەتوانن سود لە پێکهاتەی ئاڵۆز وەربگرن. ئەم پێکهاتەیە لە پێنج بەش پێك دێت کە لە لاپەڕەکانی دواتری ئەم کتێبەدا هەریەکە لەو بەشانەم ڕوندەکەینەوە.

یەکـەم: دەسـت پـێ کـردن. ئامـانجی کردنـەوەی بابـەتی قسـەکردن، بەدەسـت هێنـانی سـەرنجی ئامـادەبوان لـە کۆڕەکـەدا، دروسـت کردنـی چاوەڕوانی ئەوان و بەدەست هێنانی بیروڕای بیسەرانە، ئەگەر بڕیار بێت کەسێك گوێ نەگرێت یان سەرنج نەدات، واتای قسەکردنەکەو تێگەشتنی لە دەست دەدات.

دووەم: پێشـەکی. لێرەدا بـە ئامـادەبوانی کۆڕەکـە دەڵـێین دەتانـەوێت لەبارەی چی بابەتێکەوە قسەبکەین وە بۆچی ئەم بابەتە گرنگە.

سێیەم: یەکەم خاڵ. لێرەدا بەشێوازی دەرەوەی باسـەکە دەگـەن. خـاڵی دەست پێکردنی ئێوە شوێنەکە دەڕازێنێتەوە. تا ئەو بەڵێنەی کە داوتانـە جێ بەجێی بکەن.

چوارەم: گواستنەوە بـۆ خـاڵی دواتـر. دەبێـت ڕوونـی بکەینـەوە کـەخاڵی یەکـەممان تـەواو کـردووە دەگەینـە خـاڵی دواتـر، ئەمـەش ئیشـێکی هونەرییە.

پێنجـەم: دووەمـین خـاڵی سـەرەکی. ئـەم خاڵـە دەبێـت بەشـێوەیەکی گونجاوو بەدوای خاڵی یەکەمدا باس بکرێت.

شەشەم: گواستنەوەیەکی تر. لێرەدا ڕوونی دەکەینەوە کە بە خاڵی دواتر گەشتوین.

حەوتەم: سێیەمین خاڵی سەرەکی. ئەم خاڵە بەدوای خاڵی پێشـودا بـاس دەکرێت وە ئێوە بۆ کۆتای پلانەکە ڕێنموی دەکات.

هەشتەم: پوختەو کۆکردنەوە. لێرەدا بە ئەنجام دەگەین وە لـە بیسـەران داوا دەکەین کە بێنە ناو ئیشەکەوە.

له بەشی ١_٢ دا ڕونم کردوەتەوە کە چۆن دەتوانن قسەکانی خۆتان ڕێکخراوانە بن تا بتوانن بە ڕێك و پێکی بە یەکێك لە ئامانجەکانی خۆتان بگەن. لە فێربونی کاری وتاردانێکی کاریگەر دەبێت ڕاهێنان بکەن، بەتایبەتی ڕاهێنانەکان بە دەنگی بن.

## قسەکردن بە هێزەوە:

(ئەلبێرت هیوبارد )ی نوسەری خاوەن ناوی پرسیا بوو کە چۆن کەسێك دەتوانێت ببێتە نوسەر. ئەو وەلامی دایەوە: ((چیاکترین ڕێگە بۆ بوون بە نوسەر، نوسین، نوسین، نوسین دووبارە نوسینەوەیە. ))

بەهەمان شێوە بۆ فێربوونی هونەری وتاردان، تەنها ڕێگەیەك بۆ فێربونی قسەکردن، قسەکرن، قسەکردن، قسەکردن و دووبارە قسەکردنە. فێربونی وتاربێژی هاوشێوەی فێربونی هەموو شارەزایەکی ترە. پێویستی بە ڕاهێنان و دووبارە کردنەوەیە.

یەکێك لە چیاکترین ڕێگەکانی قسەکردن، خوێندنەوەی شیعر بە دەنگی بەرزە، ئەو شیعرەی کە حەزتان لێیەو لەبیرتانەو دوای ئەو شیعرە چەند جار دووبارە بخوێننەوە. هەر جارێ کە ئەم شیعرە بە دەنگی بەرز دەخوێننەوە، هێزوو ویستن لە دەنگتاندا جێ بکەنەوە. ئاواز و دەنگ خۆشیتان بگۆڕن. لە ووشەکان دڵنیا بن.

کاتێك شیعرێکی جوان و باش دەخوێن، نەك تەنها فێر دەبن کە ڕستەی باش دروست بکەن بەڵکو دەتوانن لە ووشەی جۆراوجۆری زیاتر سود وەربگرن تا قسەکانتان کاریگەری زیاتری هەبیت، بنچینەی لەم بڕیارەدایە: خەڵکی قسەکانی ئێوە لە بیر دەکەن، بەلام شێوازی وتنی لەبیر ناکەن و لەیادیاندا دەمێنێتەوە. کاتێك دڵنیا دەبن لە ووشەیەك بۆ

ووشـەیەکی تـر، کاتێـك دڵنیـا دەبـن لـە ڕسـتەیەك بـۆ ڕسـتەیەکی تـر، بەشێوازێك قسە دەکەن. کە بیسەران سەرنجی بابەتەکەی ئێوە دەدەن و ئاگایان لێیە. ڕێگەیەکی تر، خوێندنەوەی کتێبە ئەدەبیەکان لە زمانەکەی خۆتاندا.

## لەخەڵکانی ترەوە فێربن:

یەکێك لە چیاکترین ڕێگاکان بۆ ئەوەی ببنە وتاربێژێکی باش، ئەمەیە کە تا ئاستێك کە دەتوانن گوێ بۆ قسەی وتاردەرەکانی تر بگرن. سەرنجیان بدەن، لـە چـۆنیەتی ڕێکردنیـان، جوڵـەکردنیان و سـەرنجیش بدەنـە ئامۆژگاریـەکانیان، سـەرنج بـدەن بـزانن وتـاردەرێکی بـە ئـەزموون چـۆن دەست بە وتارەکان و قسەکانی دەکات.

لەو خاڵانەی کە دەتەوێت سەرنج بدە، بۆ هەر یەك لە خاڵەکان لە یەکەوە تا ١٠ نمرە بدە. بیر لەوە بکەنەوە کەئەم نمرانە لە کارەکەی خۆتدا باشتر بکەیت.

هەنـدێك لـە وتـاردەرە باشـەکان کـە وتارەکانیـان لەسـەر سـی دی تۆمـار کردووە گـوێ بگـرن. سـی دیەکـە دووبـارەو چـەند بـارە بکەنـەوەو گـوێی لێبگرن. بزانن ئەو وتاردەرە لە چی پەندێك یان قسـەیەکی بـەنرخ سـود وەردەگرێـت. بـۆ ئـەوەی کرپارەکـانی خـۆی تـێ دەگەیـەنێت و ڕازیـان دەکات.

## پـوختـە:

خـاڵی سـەرنج ڕاکـێش لـەبارەی پەیوەندییەکانـەوە ئەمەیـە بـەجێ بەجێکردنی ئەو خاڵە ناتوانن خراپ تر ببن.

بۆ گەشتن بەتوانای و لێهاتوی دەبێت، ئامادەی ئەوەتان هەبێت کە فێر بن و ڕاهێنان بکەن. چەندین جار ئیشەکەتان دووبارە بکەنەوە. حەوتەو مانگ و تەنانەت سالأنیش ڕاهێنان لەسەر ئەم کارە بکەن. و دووبارەی بکەنەوە.

هەروەها ئاگاتان لەوە بێت پێکهینان و خۆئامادەکردنێکی باش، وتاردانی باش لە وتاردانی خراپ جیا دەکاتەوە. پلان دانێن بۆ ووشەکانتان و لە کۆتایدا ڕاهێنان لەبیر نەکەن. بزانن بە لەبەر چاوگرتنی ئەم خالأنە سنورێك لە کاردا بوونی نییە.

## بــەشــی دووەم



# پــلان دانــان و پێکــهێنــان بــە زمــانێــکی ســادە

بەهای ڕاستی پیاوێك دەبێت بەو ئامانجانە
پێوانە بکرێت کە بەدوایدا دەگەڕێت.

"مارکۆس ئۆرلیۆس"

٩٠٪ی سەرکەوتنی ئێوە وەك وتاربێژێك پەیوەندی بەمەوە هەیە کە چۆن پلانی وتاربێژی خۆت دابڕێژیت.

(ئەرنست ) سەردەمانێك نوسی: ((لەبری هەر ووشەیەك کە دەینوسن، دەبێت شارەزایتان هەبێت لە ١٠ووشەی هاوشێوە، بەدەر لەم شێوەیە خوێنەر بەم ئەنجامە دەگات کە مەبەستەکەتان ڕاست نییە. )) بەڵام لە بارەی قسەکردن دەبێت لە بری هەر ووشەیەك کەدەیڵێن، ١٠٠ووشە بخوێننەوەو لەیەکی بدەنەوە، بەدەر لەم شێوەیە بیسەر بەم ئەنجامە دەگات کە لەخۆتانەوە قسە دەکەن. بیسەر خێرا تێدەگات کە زانست و زانیاریەکانی بێ ناوەڕۆکە و لە بابەتێك کە لەسەری قسە دەکات زانیاریەکی ئەوتۆیان نییە، نەك تەنیا دەبێت ئامادە بن، بەڵکو دەبێت بە تەواوی شارەزایەکی زۆر باشتان هەبێت.

پێکهێنانی لاواز لە وتاردا هۆکارێکە تا بیسەرانی ئێوە، زانست و باوڕی ئێوە لانی کەم بەدەست بهێنن، ئەگەر خۆتان بۆ وتاردان ئامادە نەکردوە

لەوە خراپ تر ئەوەیە ئەگەر بە ئامادەبوانی کۆڕەکە بڵێین کە لە بارەی چی بابەتێکەوە قسەبکەین. شارەزاییەکی ئەوتۆتان نیە لەسەر هەمان بابەت کە ئامادەبوان دیاری دەکەن. ئامادەبوان خێرا پەیوەندییان لەگەڵ ئێوەدا دەپچڕێنن، تەنانەت ئەگەر بە جوانیش قسە بکەن، لەڕویەکی ترەوە پێکهێنانی باشتری خێرای خۆیان نیشان دەدەن. پێکهێنانی باش لەسەر بیسەرانی ئێوە کاریگەر دەبێت تا هەواڵی ئێوە باشتر وەربگرن.

## بەتایبەتمەندیەکانی بیسەرانی خۆتان دەست پێ بکەن:

پێکهێنانی خاڵی دەست پێ کردن کەسانێك هەن کە بڕیارە گوێ بیستی هەواڵتان بن. لەبیرتان بێت کە وتاری ئێوە بۆ ئەوانە، بۆ ئێوە نییە. بەشێوەیەك دەست پێبکەن وەك ئەوەی لێکۆڵەری بازاڕ بن وە سور بن لەسەر ئەوەی کە کڕیارەکانی خۆتان بەشێوەیەکی تەواو بناسن. ئەوان بەتەواوی چی کەسانێکن؟ چی کەسانێك لە کۆڕی وتاربێژی ئێوەدا ئامادەییان هەیە؟ ئەم خاڵە گرنگە بۆ ڕەخنەی وتاربێژی کاریگەر بۆ ڕێکخستنێکی زۆر باش. سەرنجی ئەم خاڵانەی خوارەوە بدەن:

### تەمەن و سنوری تەمەن:

کەسانێك کە بڕیارە لە کۆڕەکەی ئێوەدا ئامادەبن تەمەنیان چەند ساڵە؟ وە لە چی قۆناغێکی تەمەن دان؟ ئامادەبوانی گەنج تێگەشتنێکی جیاوازیان هەیە لە زانست و ڕێو ڕەسمدا لە بەراورد کردن لەگەڵ ئەوانەی کە بەتەمەن ترن کەواتە بوار جیاوازیان هەیە. کەواتە زانینی تەمەنی بیسەران زۆر گرنکە.

## ڕەگـەز:

تێکـەڵاوی ڕەگـەزی لـە کـۆڕی وتاربێـژی ئێـوەدا چـۆنە؟ هەنـدێ جـار بەشداربوان لە کۆڕەکانی مندا لە٥٠٪ی پیاون وە ٥٠٪ی ژنـن وە هەنـدێك جار لەوانەیە پیاوەکان ٩٥٪یان بەشداربن لە کۆڕەکەداو تایبەتی کـەن بـە خۆیانەوە وە هەندێك جار ژنەکان لەم ئاستەدا دەردەکەون.

## دەسکەوت:

دەسکەوتی ئـەو کەسانەی کـە لـە کۆڕەکـەدا بەشـداری دەکـەن لـە چـی ئاستێکدایە؟ بـە شـێوەیەکی ناوەنـدی دەسـکەوتیان چـەندە؟ کـەمترین دەسـکەوتو زۆرتـرین دەسـکەوت لـە چـی ئاسـتێکدایە؟ بەتایبـەتی دەسـکەوتیان چـۆن بەدەسـت دەهێـنن و چـی هۆکارێـك لەسـەر ئـەم دەسکەوتانە کاریگەری دەبێت؟ بە زانست و زانیاری لەم بوارەدا دەتـوانن نمونەکانی خۆتان لە بواری دەسکەوتی ئامادەبوانی کۆڕەکە هەڵبژێرن.

## بڕوانامە:

بواری خوێندنی کەسانێك کە بڕیارە لە کۆڕی وتاربێژی ئێوەدا ئامـادە بـن لـە چـی ئاسـتێکدایە؟ ئایـا خوێنـدەوارییان لـە ئاسـتی دەرچـیوانی دواناوەندی دایـە؟ ئایـا دەرچـیوی زانکـۆن؟ بـە زانینـی ئـەم زانیاریانـە دەتـوانن بەسـەرنج دان لـە ئاسـتی خوێنـدەواری و زانیـاری ئـەوان قسـە بکەن و نمونە بهێننەوە.

## کارو پیشە:

ئەو کەسانەی کە لە کۆڕەکەدا بەشدار دەبـن چـۆن ژیـان بەسـەر دەبـەن؟ ماوەی چەندە لەم بوارەدا ئیش دەکەن؟ لە کار و پیشـەی ئەوانـدا ڕۆژانـە

چیبیان دەست دەکەوێت؟ ئایا سەردەمێك لە گەشەو پەرەسەندن دەگوزەرێنن یان لە دۆخی وەستاوی دان.

## دەرفەتی خێزانی:

دەرفەتی خێزانی ئامادەبوانی ئێوە لە چی دۆخێکدایە؟ ئایا بێ هاوسەرن، یان هاوسەرگیریان کردووە، تەلاق دراون، یا بێوەژنن؟ واتە ئایا زۆربەی ئامادەبوان هاوسەردارن یان بێ هاوسەرن؟ ئایا زۆربەی ئامادەبوان منداڵ دارن؟ ئەمانە خاڵێکی گرنگن کە دەبێت زانیاریتان لە سەریان هەبێت.

### زانیاری ئامادەبوانی کۆڕەکە لەسەر بابەتی قسەکردنەکە:

ئامادەبوانی کۆڕەکەی ئێوە تا چی ڕادەیەك لە سەر ئەو بابەتەی کە قسەی لەسەر دەکەن زانیارییان هەیە؟ تا چی ڕادەیەك دەزانن کە دەتانەوێت لەبارەی چی بابەتێکەوە قسە بکەن؟ ئایا ئامادەبوانی کۆڕەکەی ئێوە تازە شارەزا دەبن؟ ئایا لە زانست و زانیاری تەواودا شارەزاییان هەیە؟ زانینی ئەم بابەتانەو شارەزا بونیان یارمەتی ئێوە دەدات کە وتارێکی باش پێشکەش بکەن.

## چۆن بیر دەکەنەوە:

بە نوسینی ئەم پرسیارانەی کە لە ژێرەوەدا هاتون شێوازی بیرکردنەوەی کەسانێك کە بڕیارە لە کۆڕی ئێوەدا ئامادەبن لێکبدەنەوە:

*چی ئامانج و ئاواتێك لە مێشکیاندا گەشە پێدەدەن؟

*هیوا و وترسی ئەوان لە پەیوەنی وتاردانی ئێوەدا چییە؟

*چی داواکارییەکیان هەیە کە دەتوانن چارەسەری بکەن؟
*بەهاو باوڕەکانی ئەوان کامانەیە؟
*زانیاری و شارەزای ئەوان لە چی ئاستێکدایە؟
*ڕێگەی ڕامیاریان چۆنە؟
*چی باوریکّی دینی و چی پەیمانێکیان هەیە؟
*بێتاقەتی و کێشەو گرفتەکانی ئەوان چیەین؟
تیگەشتن لەم پرسیارانە نەخشێکی سەرەکی باسەکەی ئێوەیە، کە ئەگەر ئەم زانیاریانە بزانن. گاریگەریەکی زۆری لەسەر بابەتەکە و وتاردانەکەی ئێوە دەبێت. وە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوانتاندا دروست ببێت. دەبێت هەوڵ بدەن کە ئەم زانیاریانە بزانن.

## داواکارییە هاوبەشەکان:

تێگەشتنی ئەم خاڵە زۆر گرنگە، ئامانج و بۆچوونی ئامادەبوان لە کۆڕەکەدا وتاردانەکەی ئێوە بەیەکەوە دەبەستێتەوە. مۆڵەت بدەن نمونەیەك باس بکەم. من بۆ زۆربەی خەڵکی هەر لە فرۆشیاران هەتا کارمەندان و خاوەن نوسینگە بازرگانیەکان و. . . . . . . . . . هتد قسەم کردووە و قسەش دەکەم ئامانج و خەونی ئەم کەسانە ئەوەیە کە دەیانەوێت لە داهاتوودا لە ڕووی داراییەوە سەرکەوتووبن. کەواتە منیش ئەگەر بابەتەکەشم جیاواز لەم حەزوو خەونەی ئەوان بێت.
بەڵام دواتر هەر لەو بارەشەوە قسە دەکەم، وئاماژە بەوە دەکەم کە چۆن دەتوانن دەسکەوتەکانی خۆیان زیاد بکەن و زیاتر سود وەر بگرن. لەم شێوازە هەڵس و کەوتەو قسەکردنەم ئامادەبوان زۆر خۆشیان دێت،

ڕێزی خۆیان نیشان دەدەن و بە جوانی گوێ بۆ قسەکانم دەگرن. ئێوەش دەتوانن هەمان هەڵس و کەوت و قسەکردنە بەکار بێنن.

## لە ژیانی ئەواندا چی ڕوودەدات:

جارێك دوایـان لێکـردم بـۆ کۆمپانیایـەکی گـەورەی نێـودەوڵتی کـە کەلوپەلـەکانی لەڕێگـەی وردەفرۆشـیارە کانـەوە دابـەش کرابـون لـە سەرتاسـەری وڵات دەفرۆشـت وتـار بـدەم. بڕیـار بـوو دوای ئـەوەی کـە مەقامێکی بەرزی ڕێکخراو بە بیسەران یان کاسپکاران بگەیـەنم، مـن قسـە بکەم. مەبەستی بەڕێوبەری پلەوپایە بەرز، ئەمـەبوو. کـە تـا ٣٠ ڕۆژی تـر هـەموو بەرهەمـەکانی کۆمپانیـا ڕاسـتەوخۆ بـە کڕیارەکـانی کۆمپانیـا بفرۆشـرێن. نرخـی ئـەم کەلوپەلانـەش هـەمان نـرخ بـوو کـە فرۆشـیارانی کۆمپانیا بەرهەمەکانیان دەنارد بۆ فرۆشـتن. لـە لایـەکی تـرەوە بڕیاریان دا. ئەو کڕیارانەی کـە ڕاسـتەوخۆ کـەلو پەلـەکانیان لـە کۆمپانیـا دەکڕن. داشکاندیان بۆ بکەن، دووبارەش بیان دەنەوە.

بـە هـەمان شێوەی کـە دەتـوانن بـیر بکەنـەوە. فرۆشـیارانی ئامـادە لـە کۆڕەکەدا بە تەواوی سەرسام بووبون. تەواوی ژیانیان بەسـترابویەوە بـەو بڕە پارەیـەی کـە لـە شـوێنی فرۆشـتنەکە وەریـان دەگـرت. ئێسـتا بـەم سیاسـەتە تـازەی ڕونکـەرەوەکان کڕیـاران دەیـان تـوانی ڕاسـتەوخۆ لـە کۆمپانیاوە کەل وپەل بکڕن. فرۆشیاران لەو بارودۆخەی کە پـێش هـاتبوو زۆر نارەحەت بوون.

کۆمپانیا میواندارى منیان کرد لە بەرامبەردا بڕێك پارەدا کە بـە منیـان دا. بۆئەوەی کڕیاران هان بدەم کە کەل و پەلەکان زیـاتر بکـڕن. وە ئەمـە لـە کاتێکدا بـوو کـە دەرامـەتی یەکـەمی ئـەوان بـە شـێوەیەکی زۆر کـەمی

كردبوو. لەبيرمە كاتێك سەيرى دەم وچاوى فرۆشيارانم دەكرد هەموويان بێزار بوون. وەك دوژمنى خۆيان سەيرى منيان دەكرد. ئاگاتان لێ بێت. هەميشە بزانن لەو كۆمپانيادا ئەو كۆمەڵە كەسەى كە بڕيارە گوێ بۆ ئێوە بگرن جەويان چۆنە يان بە چى بارودۆخێكدا تێ دەپەڕن.

## ئەركەكانى خۆتان جێ بەجێبكەن:

### بۆ ناسينى جەماوەر و تايبەتمەنديەكانيان بڕۆن

كاتێك لەگەڵ كەسان و ئيش كەرانى پيشەسازييەكى تايبەت قسەدەكەن، پێش وتاردان بۆ ئەوان دەبێت تا ڕادەيەك كە دەتوانن زانيارى لە بارەى ئەوانەوە بە دەست بێنن. ئايا بازاڕى ئەو كالآيە كە دەيفرۆشن چىاك و گونجاوە؟ ئايا ئەوان لە كاتى گەشەكردندان. ئايا لە بازاڕدا گەشە بوون پێچىەوانەى هەيە؟ بابەتى ڕاميارى و بابەتى بازرگانى لە ئێستادا لە سەر ئەوان چى كاريگەريەك بەجێ دێڵێت؟ لە كاتى پلانداندا بۆ وتاربێژێك يا باس كردنى بەرنامەيەك سەرنجى ئەم خاڵانەى خوارەوە بدەن.

### بزانن لە بازرگانى ئەواندا چى ڕوودەدات:

سەردەمێك بانگهێشتى منيان كرد كە بۆ كۆمەڵێك لە بەڕێو بەرە گەورەكانى كۆمپانيايەكى چەند نەتەوەى قسە بكەم. پێش تر ئاشكرايان كرد يان بە منيان ووت كە كۆمەڵێ لە بەڕێوبەرانى كۆمپانياكەيان دەركردووە. من بۆ كەسانێك قسەم دەكرد كە لەو كۆمپانيايەدا مابونەوە. بەلآم ڕێك پێش ئەوەى بەهرەدارى شەخسى و كاريگەرى ڕابەرى قسە بكەم، كۆمپانيا ئاشكراى كرد كە ژمارەيەكى ترى لە بەڕێوبەران دەركردووە. زۆربەى ئەو بەڕێوبەرانەى كە لە كۆڕەكەدا ئامادە بوون. تا

٣٠ ڕۆژی تر پیشەکەیان لێ دەست دەدا. بەم حاڵ و نیگەرانیەوە هیچی خۆشیەك لەواندا نەبوو. تەنها بابەتێك کە ئامادەبوانی کۆڕەکەی من دەیان توانی بیری لێ بکەنەوە ئەمە بوو. کە لەوانەیە ئەو کەسەی کە دواتر دەر دەکرێ یەکێك بێت لەم کۆمەڵەیە. ئەمە باروودۆخێکی باش نە بوو بەڵام پێویست بوو کە ئێوە ئەم بابەتە بزانن. کات سەرف بکەن و ئاگاداری ئەم بابەتە بن.

## بزانن باروودۆخی ناوخۆی چۆنە:

لەو شارەی کە دەتانەوێت قسەبکەن، یان وتار بدەن بزانن چی ڕوودەدات. بۆ نمونە لە زۆربەی ئەو قسەکردنانەی مندا کە لە شارەکاندا ئەنجامم داوە. تیپێکی وەرزشی ناوخۆی لە یەك یان دوو ڕۆژی پێشوتردا براوە یان دۆڕاوەی پێشبڕکێیەکی پاڵەوانی بووە. وە گرنگە زانیاری یان شارەزایتان لەسەر ئەم بابەتانە هەبێت، وە ئەو قسانەی سەرەتای خۆتان لە بیربکەن. بەدەر لەم شێوەیە بیسەران و ئامادەبوانی کۆڕەکەی ئێوە دەبەسترێنەوە بە خەیاڵی پێشبڕکێکەوە و ئاگایان لە قسەکانی ئێوە نامێنێت و گوێتان بۆ ناگرن.

## بزانن چی کەسێکی تر پێش ئێوە وتاری بۆ ئەوان داوە:

بەشێکی تر لە پێکهێنانەکان ئەمەیە، دەبێت بزانن کە پێش ئێوە چی وتاردەرێکی تر وتاری بۆ ئەمان داوە. ئەمەش لە ڕێگەی ئامادەبوانی کۆڕکەوە دەزانرێت. دەبێت بزانن چی کەسانێك یان چی کەسێك پێش ئێوە لە سەر ئەم بابەتە قسەی لەگەڵ ئەماندا کردووە؟ بیسەران ڕازی بوون لە وتاردانەکەی ئەو یان ئەوان ئەگەر نارازی بوون چۆن

نارەزایەتیان نیشان داوە؟ ئایا ئەوەی بیستویانە حەزیان لێ بووە؟ ئایا بێزار بوون لە وتاردەری پێشوو؟ ئەگەر بەم شێوەیەیە، بۆچی وەها رووداوێك رووی داوە؟ ئەگەر پێشوازیان لە وتاردەرەکەی پێشو کرد چی هۆکارێکی هەبوو؟ ئەو لە چی بوارێکدا قسەی کرد؟

## قسەکانی خۆتان بەراورد بکەن لەگەڵ داواکاریەکان بیسەراندا:

کۆتاییەن بۆ کۆمەڵێکی ٤٠٠٠ کەسی قسەم دەکرد. لە کاتی شیاودا تێبینیەکەم بەکار هێنا تا بۆچونەکەم ئامادە بکەم. پێشتر لە بارەی داواکارییەکانی بیسەران لەگەڵ رێکخەرانی کۆرەکەدا بە شێوەیەکی تێرو تەسەلی قسەم کردبوو. ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە لە ماوەی ٩٠ خولەك قسە کردن توانیم لە زۆربەی مەبەستەکانی ئەوان تێبگەم. توانیم لە سەر نیگەرانی، و بارودۆخی ململانێیان لە بازاردا و لەسەر رەوتی ئایندەیان قسە بکەم. پاش وتاردانەکەم سەرۆکی کۆمپانیا منی بردە سوچێك و پێی گوتم ئەمە باشترین وتاردان بوو لە تەمەنمدا کە بیستبێتم. کۆمپانیای ناوبراو پێشتر میواندارى وتاردەرەکانی تری کردبوو. لە بەرامبەر برە پارەیەکی زۆردا، بەڵام ئەوان سەرکەوتو نەبو بوون. ئەو دەیگوت وتاردەرانی پێشو کەمترین کاریگەرییان لە سەر نیگەرانیەکانی کۆمپانیا و کرێکارەکان نەبووە.

## بە لە پێش چاوگرتنی ئەنجام دەست پێ بکەن:

ئەگەر بڕیار بێت لە کۆتای وتاردانەکەدا بتانەوێت لەگەڵ ئامادەبوانی کۆرەکە وتو وێژ بکەن و لەوان بپرسن کە لەم وتاردانەدا چی فێر بوون، حەز دەکەن چی وەڵامێکتان بدەنەوە؟ قسەکانی خۆتان بە شێوەیەك

بەکاربهێنن کە ئەنجامەکەی بەو شێوەیە بێت کە دەتانەوێت وەلأمتان بدەنەوە.

## کات لە بیر مەکەن:

دەبێت بە تەواوی بزانن چی هەلێکتان بۆ قسەکردن هەیە. هەندێك کات ئامادەبوان چاوەڕێی ئەوە دەکەن ٪۷۵ی کاتی پێویست قسە بکەن و ٪۲۵ی ئەو کاتەی کە ماوەتەوە بە پرسیاری تایبەت وەلأم بدەنەوە. لە هەندێك کاتدا ئامادەبوان دەیانەوێت لە تەواوی کاتی بەرنامەکەدا ئێوە قسەبکەن. لە هەرکاتێکدا وریای کاتی قسەکردنی خۆتا بن.

زۆربەی قسەکان، کۆڕەکان، کۆبونەوە وتاربێژییەکان کاتێکی دیاریکراویان هەیە. سەردەمانێك بۆ وتاردان بۆ ۵۰۰۰ کەس بانگهێشت کرا بووم. ڕێکخەران بە جۆرێك دڵنیا بوون لەوەی کە من وتارەکەم بنوسمەوە. ئەوان دەیان ویست بزانن کە وتاردانەکەی من چەندێ کات دەبات. پێش من وتاردەرێك بڕیار بوو کە وتار بدات ماوەی وتاردانەکەشیان بۆ دیاری کردبوو، کە ۲۲ خولەك قسە بکات. بەلأم وتاردەرەکە بۆ ماوەی ۲۸ خولەك قسەی کرد. کاتێك لە پشتی وتاردانەوە وەستا بووم. تێگەشتم کە ڕێکخەران یان ئامادەبوان زۆر ناڕەحت و توڕ بوون. بۆ ئەوان ئەوەی کە وتاربێژ گوتی گرنگ نەبوو. هەموو ناڕەحەتی ئەوان ئەمە بوو وتاردەر زیاتر لەو کاتەی کە بۆی دانرا بوو قسەی کردبوو. وە هەرگیز جارێکی تر ئەم وتاردەرەیان بانگهێشت نەکردەوە.

## دوای ئەوەی ئەرکەکانتان جێ بەجێ کرد، ئامادە بن:

ڕێگەیەکی بەهێز بۆ پێکهێنان و ئامادە بوون بونی هەیە کە من ساڵانێکە لەو ڕێگەیە سود وەردەگرم. ئیشەکەم بە وەرەقەیەکی سپی دەس پێ دەکەم. ناونیشانی وتارەکەم لە سەرووی وەرەقەکە یان لە ناوڕاستیدا دەنوسم. دوای بە ئەندازەی یەك دێڕ لەبارەی ئامانجی وتاردردانەکەم دەنوسم. بڕیارە وتار دانەکەی من کاریگەرییەکی هەبێت؟ دواتر لە وتاردانەکەدا هەر بیرو بۆچوونێك بە مێشکمدا بێت دەینوسم.

هەندێ جار نوسینەکانم بۆ دوو یان سێ لاپەڕە زیاد دەبن. دوای ئەمە سەر دێڕی نوسراوە تایبەتیەکان هەڵدەبژێرم. ڕیز بەندییەکی گونجاویان بۆ دەکەم. ئێوەش دەتوانن هەمان ئیشی من بکەن. سەرسام دەبن لەوەی کە کاتێك کە خۆتان مەجبور دەکەن ٢٠ یا ٣٠ یان ٥٠ خاڵ کە بە مێشکتاندا دێت پلانێکی گونجاویان دەزانن دەینوسنەوە. چەند بابەت و بۆچوونێك بۆ باس کردن پەیدا دەکەن.

دوای ئەوەی ئەم هەموو خاڵەتان ڕێکخست، بە پێنووسێکی ڕەنگدار بە پێنوسێ سور ئەو بەشەی کە زۆرترین کاریگەری لە سەر وتاردانەکەی ئێوە هەیە دیاری بکەن.

## یاسای پێك هێنان:

دوای ئەوەی کە خاڵە گرنگەکانتان دیاری کرد. دەتوانن لە یاسای پێك هێنان بەو شێوەیەی کە لە خوارەوە ئاماژەم پێ کردووە سود وەرگرن.

ئەلف) بیرو بۆچوون:
بیر، بۆچیوونەکان یان ڕاستیەکان ئاشکرا بکەن. دەتوانن بڵێن: ((ژمارەیەکی زیاتر لە خەڵکی لە ١٠ ساڵی داهاتوودا زیاتر لە ١٠٠ ساڵی ڕابردوو دەتوانن دەرامەتی زیاتر بە دەست بێنن. ))
ب) هۆکار:
هۆکارەکانتان بۆ ئەم پێشبینیە ڕوون بکەنەوە. پێشتر دەتوانن بڵێن: ((ژمارەی ملیۆنلەرەکان و ملیاردێرەکانی خۆپەروەر لە سەردەمێکدا لە چاو پێنج ساڵی ڕابردوودا بۆ لە ٦٠٪ زیادی کردووە. ڕادەی زیاد بوونەکەش شێوەیەکی باشی هەیە.))
ج) نمونە:
بۆچیونەکانی خۆتان نیشان بدەن یان ئەوان جێگیر بکەن. بۆ نمونە دەتوانن بڵێن: ((لە ساڵی ١٩٠٠دا ٥٠٠٠ ملیۆنەر لە ئەمریکا ژیانیان بەسەر دەبرد. لەو سەردەمەدا ملیاردلێری بیانی لەم وڵاتەدا نەبوو. لە ساڵی ٢٠٠٠ دا ژمارەی ملیاردێرەکان بۆ ٥٠٠ کەس زیادی کرد. تاکو ساڵی ٢٠٠٧ بە پشت بەستن بە ڕۆژنامەی بزنس ٨، ٩٠٠، ٠٠٠ ملیۆنەر لە ئەمریکادا و زیاتر لە٧٠٠ ملیاردلێرد لە سەرتاسەری دنیادا ژیانیان بە سەر دەبرد.
د) بۆچوون:
بۆچوونی یەکەمی خۆتان بەهێز بکەن. بۆ نمونە دەتوانن بڵێن: ((بۆ ئێوە کۆمەڵگەی داهێنەر هەرگیز هێندەی ئەمڕۆ هەلی گونجاوی نەبووە. کە بە سەرکەوتنی دارای بگات. مەگەر بەیانی و ساڵی داهاتوو کە ئەم هەلە گونجاوەی بۆ دروست ببێت. ))

## پێکهێنانی یاسای ئیش کردن:

دەتوانن یاسای پێکهێنان لە تەنیشت یەکترەوە دابنێن:

لە مێژووی ژیانی مرۆڤایەتیدا هەرگیز هەلێکی باشی وەك ئەمڕۆ بۆ هەڵ نەکەوتووە. خاوەنی هەر بەشێك لە بەشەکانی نیشتەجێ بوون لە هەر سەردەمێك بۆ سەردەمێکی تر زیادی کردووە. بێکاری لە هەر سەردەمێکدا کەمترە. لە دنیای بازرگانی و پیشەسازیدا لەوانەیە ڕووبەڕووی خێرا ترین گەشە ببینەوە. لە ساڵی ڕابردوودا زیاتر لە١، ٠٠٠، ٠٠٠ کەس لەم وڵاتە دەستیان کرد بە بازرگانیە تایبەتیەکەی خۆیان، ئێمە لە سەردمێکی گەورەدا دەژین. لە چەند ساڵی داهاتودا زۆربەی خەڵك ئەو دەرامەتەی کە بەدەستی دێنن زیاترە لەو دەرامەتەی کە لە١٠٠ ساڵی ڕابردوودا دەستیان کەوتبوو.

## ڕێگەی بەفرماڵ:

دەتوانن بۆ پلاندانانی قسەکانتان سود لە ڕێگەی بە فرماڵ وەربگرن. بە هەمان شێوەی کە دەزانن. ئێوە مێشکتان دەبێت بە دووبەشەوە کە بەشی لای ڕاست، بەشی لای چەپە. بەشی لای چەپ لە ژێر کاریگەری ڕاستیەکان و زانیاریەکاندا کارا دەبێت. بەڵام بەشی لای ڕاست لە ژێر کاریگەری هەستەکان و چیرۆکەکان و گێڕانەوەی قسەی کەسێك و نمونەکان کارا دەبێت.

شێوازی سود وەرگرتن لەم ڕێگەیە سادەیە: ڕاستیەك دەڵێن و بە چیرۆکێك ئاماژەی پێ دەکەن. دواتر ڕاستیەکی تر بڵێن و لە گێڕانەوەی قسەی کەسێك سود وەربگرن. جارێکی تریش بە ڕاستیەکی تر ئاماژە بکەن. لە بەردەوامبونی ئەودا نمونەیەك بهێننەوە. لە ڕاستیدا هەر وەك فلچەی ئوتۆمبیلێکە لە لایەکی ترەوە بۆ لایەکی تر دەڕوات.

## ڕێگەی بازنەی:

بۆ ئەوەی پلان داڕێژن بۆ قسەکردنی خۆتان لە سەر وەرەقەیەک، دەتوانن لە وێنەیەک یان خشتەیەک سود وەربگرن، من لە ناوەڕاستی وەرەقەیەک نزیکەی ٥ بازنەی گەورە دەکێشم. هەریەکێک لە بازنەکان ئاماژە بۆ بابەتێك دەدات. بازنەی یەکەم، دەستپێکی بابەتێکە کە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی بیسەران و ئامادەبوانی کۆڕەکە سودی لێ وەردەگرم. بازنەی دووەم و سێیەم و چوارم خاڵێکی گرنگن کە دەمەوێت باسیان بکەم و دواتر بازنەی پێنجەم ئەنجام و پوختەیە. ئەگەر بڕیار بێت وتاردانێکی درێژتر بێت واتە ماوەکەی زۆرتر بێت. هەندێك کات ٧ بازنە لەسەر وەرەقەکە دەکێشم وە ئەگەر پێویست بکات لاپەڕەی دووەمی وەرەقەکەش بەکا دێنم. لە هەر بارودۆخێکدا بازنەی یەکەم پێویستە دەسپێك و بازنەی کۆتای پێویستە کۆکراوە و ئەنجام و پوختە بێت. بازنەی ناوەندیش خاڵە سەرەکیەکانن کە دەمەوێت باسیان بکەم وبیان خەمە ڕوو.

### بە وردی پلان بۆ دەسپێکردن و واتای وتارەکە دابنێن:

پلان دانان بۆ دەستپێکردنی وتاردانەکە زۆر گرنگە. بیر بکەنەوە، لە یەك بە یەکی ئەو ووشانەی کە بە کاریان دێنن. دڵنیابنەوە لەیەك بەیەکی ووشەکان و ڕاهێنان لە سەر ووشەکان بکەن. دەتوانن لە بەرامبەر ئاوێنەیەکدا بوەستن و بەدەنگی بەرز ووشەکان یەك بە یەك دووبارە بکەنەوە و ڕاهێنانیان لە سەر بکەن. وتاردانی سەرەتای ئێوە کۆڕەکە دروست دەکات، هەروەها چاوەڕوانیش دروست دەکات. واتایەکی ڕوون

بە ئامادەبوان دەدات. هیچی شتێك بە شانس و ناوچاوەوە مەبەستنەوە.

لە بارەی كۆكردنەوەی قسە كردنەكانیش پێویستتان بە پێكهێنانی ووشەیە. بزانن بۆ كۆكردنەوەی بابەتێك چیتان دەوێت بیڵێن.

## پلان دانان بۆ بەشی چاوپێكەوتن:

بۆ باس كردنی وتارەكەتان بە شێوازی چاوپێكەوتن بۆ ڕوون كردنەوەی دەبێت لە بابەتەكانی خۆتان كەڵك وەرگرن. كەڵك وەرگرتن لەم شێوازانە سەرنجی ئامادەبوان زیاتر ڕادەكێشێت.

## ڕێگەی گۆچانی سحری (جادوی):

یەكێكی تر لە ڕێگاكان كە من ناوم ناوە گۆچیانی سحری (جادوی). لە كاتی قسەكردنمدا قەڵەمێكی ئاڵتونی لە باخەڵمدا دەرئەهێنم. دوای بە ئامادەبوانی كۆڕەكە دەڵێم. بیر بكەنەوە، كە دەتوانن گۆچیانێكی سحری بجوڵێنن و بە هەلێكی باش بگەن.

دواتر قەڵەمە ئاڵتونیەكە دەجوڵێنم و كات بە ئەوان دەدەم بۆ ئەوەی هەموو ئامادەبوان لە مێشكیاندا بیر لە دەرفەتێكی باش بكەنەوە. ئەو كاتە ئاماژە بە هەندێك لە ڕێنمونیەكان دەكەم. بۆ ئەوەی بیسەران بتوانن سودیان لێ وەربگرن بۆ باشتر كردنی دەرفەتەكانیان.

## سود وەرگرتن لەپاوەرپۆینت لە كاتی وتارداندا:

ئەگەر بتانەوێت سود لە پاوەر پۆینت وەرگرن لە كاتی وتارداندا. پەیوەندی بە هۆكاری جۆراو جۆرەوە هەیە. لە هونەری وتاربێژی

سەرکەوتوو، هەندێك کەس هێندە پاوەرپۆینت بە کار دێنێت. کە کەسیەتی و زانیار خۆی لە دەست دەدات.

## یاسای پێنج بە پێنج:

لە هیچی بارودۆخێکدا لە سەر وەرەقەکە زیاتر لە ٥ دێڕ مەنوسن. هەر دێڕێکیش نابێت لە ٥ ووشە زیاتر بێت. هەر شتێك زیاتر لە سنوری خۆی بیسەران بێ تاقەت و بێ ئاگا دەکات لە وتاردانەکە دەکات. لە ژووره بچووکەکاندا بەشدار بوان کەمتر دەتوانن سود لە بابەتە دوور و درێژەکان وەربگرن.

لە هەر کاتێکدا کە دەتانەوێت سود لە وەرەقە وەربگرن. نابێت هێندە زانیاری لە سەر بنوسن. کە بیسەران یان ئامادەبوان سەرقاڵی خوێندنەوەی زانیاریەکان بن، لەبەر ئەمە سەرنجیان لای ئێوە نەمێنێت و گوێ بۆ قسەکانتان نەگرن.

ماوەیەك لەمەوبەر وتارم بۆ کۆمپانیایەکی چەند نەتەوەی دەدا، سەرۆکی کۆمپانیا پێش ئەوەی سەرەی وتاردانەکەی من بگات، بۆ ماوەی کاتژمێرێك وتاری بۆ ئامادەبوان دابو. ئەو تەنها وەرقەی بەکار دەهێنا بۆ بەردەوامی لە قسەکانیدا و هێندە زانیاری و خاڵی لەسەر نوسیبوو. هێندە سەر ئسلایدەکە جەنجاڵ بو کە هیچی کەس سەری لە بابەتەکە دەر نەدەکرد. بەلآم چونکە ئەو سەرۆکی کۆمپانیا بوو. هەموان بە ڕێزەوە گوێیان بۆ قسەکانی ئەو دەگرت. بەلآم دیار بوو کە هەمووان لە قسەکانی ئەو وڕس بوو بوون. بۆیە ئێوەش نابێت هێندە زانیار و خاڵ لەسەر سلآیدەکە بنوسن کە ئاواتان لێ ببێت.

### بەرامبەر ئەوان بوەستن و سەیری ئەوان بکەن:

کاتێك لە پاوەرپۆینت سود وەردەگرن، بەرامبەر بە ئامادەبوان بوەستن. دەبیت لەو کۆمپیوتەر و لاپتۆپەی کە لەبەر دەستاندایە یان لە بەرامبەرتانە سود وەربگرن. بابەتی سەر ئسلایدەکە یان وێنەی پشتی سەرتان روون بکەنەوە. لەتەواوی ماوەکەدا دەبێت چاوتان لەسەر ئامادەبوانی کۆڕەکە بێت و سەیریان بکەن.

کاتێك بابەتی سەر ئسلایدەکە باس دەکەن، بەفشاردانی دوگمەی سەر کۆمپیوتەرەکەی خۆتان وێنەکە لابەرن. لە بیرتان بێت شێوەی ئێوە گرنگترین بەشی هەر وتاردەرێکە. کاتێ ئسلایدەکە نیشان دەدرێت، ئامادەبوانی کۆڕەکە هەندێ کات سەیری ئسلایدەکە دەکەن و دوای سەیری شێوەتان دەکەن.

### لە ژێر ڕۆشنایدا بن:

کاتێك سود لە پاوەر پۆینت وەردەگرن، گرنگە کە شێوەتان یان دەموچاوتان لە ژێر ڕۆشنایدا بێت. بەداخەوە چەند جار ئەوەم بینیوە لە بەڕێوبەرە گەورەکان بۆ ئەوەی وێنەی پشتی سەریان بە جوانی دیار بێت، گڵۆپەکان دەکوژێننەوە. بەم شێوەیە خۆیان لە تاریکیدا دەوەستن و ئامادەبوانی کۆڕەکە ناتوانن بەباشی پەیوەندی بە وتاردەرەکانەوە ببەستن.

### پاوەرپۆینت لە کۆتایدا ئامێرێکی فێرکەرە:

لە پاوەرپۆینت وەك ئامێرێکی یارمەتیدەر بۆ تێگەیاندنی بابەتەکانتان سود وەربگرن. ئەوەی کە لە قسەکردنیدا بابەتێکی هەیە ئێوەن.

پاوەرپۆینت بڕیارە تەنها یارمەتی دەری ئێوە بێت بۆ ئەوەی بابەتەکەی خۆتان بەباشی و کاریگەرتر بۆ ئامادەبوانی کۆڕەکە باس بکەن.

## چاوەڕوانی ڕووداوی لە ناکاو بن:

بە دڵنیایەوە لەوانەیە بینیبێتتان کە وتاردەرێك بۆ باس کردنی وتارەکەی پشت بە پاوەرپۆینت دەبەستێت، دوای ئەوەی کە پاوەرپۆینتەکە کێشەی تێدەکەوێت یان تێك دەچێت. لەم کاتەدا شارەزایان بۆ چاك کردنەوەی ئەم ئامێرە دێنە سەر شانۆ و هەوڵێکی زۆر دەدەن بۆ چارە سەر کردنی. کەسە شارەزاکان داوای یارمەتی لە وتاردەرەکە دەکەن. بەم شێوەیە وتاردەرەکە لە وتاردان دەوەستێت. ئەگەر پێش وتاردانەکە دڵنیا بینەوە لە بەرنامەو ئامێرەکان ئەوا لەوە دەچێ ئەم ڕووداوانە ڕوو نەدەن.

## ئاگاتان لە خۆتان و هەواڵەکەتان بێت:

لەهەر کاتێکدا کە سود لە پاوەرپۆینت وەردەگرن، قسەکانتان دەبێت واتایەکی بەهێزی هەبێت بۆ ئەوەی سەرنجی ئامادەبوانی کۆڕەکە بۆ لای خۆتان ڕابکێشن. دوای دەتوانن بۆ پیشاندانی ڕەقەمەکان و خاڵە گرنگەکان سود لە پاوەرپۆینتەکە وەربگرن. کاتێك خاڵ و بابەتی سەر پاوەرپوۆینتەکەتان باس کرد بە شێوازێك لە شێوازەکان پاوەرپۆینتەکە بوکژێننەوە. بۆ ئەوەی ئامادەبوان سەرقاڵی ئەو نەبن و ئاگایان لە ئێوە بێت.

## پلان دانان بۆ وتاردانێکی باش:

هەر وتاردەرێك لە هەر بارودۆخێکدا سێ باسی هەیە، یەکەم. قسە کردنێکە کە وتاردەر لەسەرەتای وتاردانەکەیدا قسە دەکات. دووەم، باسێکە کە وتاردەر باسی دەکات. سێیەم، قسەکردنێکە کە لە کۆتای وتاردانەکەدا وتاردەر قسەی لە سەر دەکات و ئەو هیوای وایە کە توانیبێتی قسەکردن و باسەکانی سودی هەبوو بێت بۆ گوێگران و ئامادەبوانی.

## لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی تر بڕۆن:

بەرنامەی وتاردانەکەتان بە جۆرێك پلانی بۆ دارێژن کە بە تەواو کردنی بەشێك بۆ بەشێکی ترو لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی تر بڕۆن، ئامادەبوانی کۆڕەکە بزانن کە باسێکتان تەواو کردووەو بۆ باسێکی تر بڕۆن.
سەیری بابەتەکانی خۆتان دووبار بکەنەوەو بە شوێن ڕێگەیەکدا بگەڕێن کە هەر سێ باسەکەی خۆتان بەیەکەوە ببەستێتەوە.

## ڕاهێنان(تەمرین) بکەن:

چەند ساڵ لەمەوبەر وتارێکی گرنگم بۆ کۆمەڵێك پێشکەش کرد. بارودۆخەکە بە شێوەیەك بوو کە ئەگەر ئامادەبوانی کۆڕەکە لە شێوەی وتاردانەکەی من خۆشیان بهاتایە. ئەوا دەیان توانی دووبارە بۆ وتاردانێکی تر بانگهێشتم بکەنەوە. بە هەمان شێوە بە جوانی وتارەکەم پێکهێناو ڕاهێنانم لەسەر کرد. پێش ئەوەی لە پشتی مێزی وتاردانەکەوە بوەستم، ٥٠ جار تەمرینم لەسەر وتاردانەکەم کردبوو.



هەر لەبەر ئەمەش وتاردانەكەم بە سەركەوتوی پێشكەش كردوو وتارەكەی منیان لە سەر سیدی تۆمار كرد، سیدی وتاردانەكەی من بۆ تەواوی جیهان نێردرا و لە تەواوی جیهاندا بلاّو بویەوە. دەیان هەزار كەس گویّ بیستی وتاردانەكانی من بوون بە زمانە جیاوازەكانی جیهان. چەند سالّ دواتر ئەم وتارانەی من زیاتر بوون و بوون بە دوانزە وتار ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر دەبوون و گەشتنە هەزار وتار. ئەمەش لە ئەنجامی ٣٧سالّ ئەزموون وتاردان.

## خالّە گرنگەكانی وتارەكە لەسەر كارتێك بە شێوەی پێڕست بنوسن:

ئەگەر لە مێزی وتاردان یان مینبەر سود وەردەگرن. یەكیّ لە باشترین نیشانێك كە دەتوانن بۆ پێكهێنانی وتاردانەكەی خۆتان بیكەن ئەوەیە كە لەسەر كارتێك خالّە گرنگەكان بە قەبارەی جیاواز بنوسن. هەر خالّێكی گرنگ لەسەر كارتێك بنوسن. ئەم خالّە گرنگە بابەتێك كە دەبێت لە بارەیەوە قسە بكەن ڕوون دەكاتەوە. كارتەكان بەپێشكەوتن و یەك بەدوای یەكی بابەتەكانی وتاردان ڕێك بخەن. بە تەواو بونی خالّی سەر كارتێك ئەو كارتە لابەرن و بڕۆنە سەر كارتێكی تر. من چەندین جار چاوم بە وتاردەرە گەورەكان كەوتووە كە لە بەرامبەر ئامادە بوانێكی زۆر لە كۆڕێكدا وەستاون و لە دەستیاندا چەندین كارت هەبووە، بەم شێوەیە وتارەكەیان پێشكەش كردوە. ئەم وتاردەرانە بۆ گەشتن بەم دەرفەتە بەرنامەڕێژی و پێكهێنان و هەولّێكی زۆریان داوە.

## سەرەتا بۆ كۆمەلّە بچووك و كەمەكان وتار بدەن:

ڕێگەیەك بۆ سەرکەوتن لە وتارداندا ئەوەیە کەپێش وتاردان بۆ کۆمەڵە گەورەکان، سەرەتا بۆ کۆمەڵە بچووکەکان وتار بدەن. ماوەیەك لەمەو پێش کۆڕێکم بۆ دەستەی بەڕێوسبەران هەبوو. کە بڕیار بوو هەموو ئامادەبوان لە کۆتای کۆڕەکەدا نانی ئێوارە بە یەکەوە بخۆن. یەکێك لە ئامادەبوانی کۆڕەکە بە گەرم و گوڕییەوە دەستی بەقسەکردن کرد. ئەو لە ڕێکخستندا بەهرەیەکی باشی هەبوو. بۆ ماوەی ٢٠ خولەك بەردەوام بوو لە قسەکردن. هەموو ئامادەبوانی کۆڕەکە بە جوانی گوێیان بۆ وتاردانەکە گرتبوو. لە کۆتای کۆڕەکەدا هەموان لە ژێر کاریگەری بیرو بۆچوونەکانی ئەودا بوون.

ئەوشەوە لەکاتی نانی ئێوارەدا دەبوایە لە بەرامبەر ٥٠٠ کەس وتارەکەی دووبارە بکردایەتەوە. من لەو کاتەدا تێگەشتم وتاردان بۆ ئەم دەستەیە هەندێك ئاڵۆزەو پێویستی بە ماوەیەك دەبوو کە دەبوایە ڕاهێنانم تێدا بکرایە چونکە ئەم کۆمەڵەیە یان ئەم دەستەیە کەسانی بەتوانای تێدا بوو.

## بە ڕێگادا بڕۆن و قسە بکەن:

یەکێك لە ڕێگەکان کە هەندێك لە وتاردەران بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ وتاربێژی سودی لێ وەردەگرن ئەم ڕێگەیەیە، کە لە شوێنێکی دیاریکراوی خۆیان ڕێ دەکەن و ئەو قسانەی کە پێویستە لە کاتی وتاردانەکەدا بیڵێن. لە هەمان کاتی ڕێ کردنەکەدا لەگەڵ خۆیاندا دەیڵێن و هەندێ کات بە دەنگێکی بەرز قسە دەکەن بۆ ئەوەی ڕاهێنانەکەیان ئاسای بێت. ئەم بەشە یان ئەم ڕێگەیە کە ڕۆشتن و قسەکردنە باشترین هۆکارە بۆ خۆئامادەکردن بۆ وتارادنە.

## لە سایتی گوگڵ لەئینتەرنێتدا زانیار لەسەر باسەکەتان وەر گرن:

کاتێك بۆ کۆمەڵێکی تایبەت قسە دەکەن، پێویستە بە تەواوی خۆتان ئامادە بکەن تا ئەو ڕادەیەی کە بڵێن پسپۆڕن لەم بوارەدا، ئەگەر تا ئەم ئاستەش نەبێت پێویستە تا ئاستی وتاردەرێکی بە ئەزمون خۆتان ئامادە بکەن. بۆ دەوڵەمند کردنی بابەتەکە و زیاتر زانیاری بە دەست هێنان لەسەر ئەو بابەتە دەتوانن لە گوگڵی ئینترنێت یان دەیان سایتی تر سود وەرگرن.

کاتێك ئەم زانیاریانە لە سەر بابەتەکانتان وەردەگرن و لە کاتی وتاردانندا ئاماژەیان پێ دەکەن بەدڵنیایەوە کاریگەریگەریەکی زۆری لەسەر ئامادەبوان دەبێت.

## لێکۆڵینەوە لە سەر کەسە سەرەکیەکان بکەن

لە ئەنجامدا یەکێك لە باشترین شێوەکانی پێکهێنان ناسینی ئەو کەسانەیە کە لە ژێر فەرمانی کەسێکی تردا لە ڕێکخراوێکدا ئیش دەکات کە تکای وتاردانی لە ئێوە کردووە. سەیری ژیاننامەی ئەوان بکەن لە ئینتەرنێتدا. ئەگەر کەسێکی ئیشکەر لە ڕێکخراوێکدا ئیش بکات، ژیانی ئەو کەسە بەدڵنیایەوە لە سایتی کۆمپانیاکەدا بونی هەیە. لە هەمان کاتیشدا دەتوانن لە ڕێکخەرانی کۆڕەکە زانیاری لە سەر ئەم کەسانە وەرگرن یان بەدەست بێنن.

کاتێك بۆ دەستەیەك وتار دەدەم، هەوڵ دەدەم زانیاری لە بارەی ئەم کەسانەوە بە دەست بێنم. دواتر لەکاتی وتاردنەکەمدا سود لە ناوەکانی ئەوان وەردەگرم، بۆ نمونە دەڵێم: ((بە دڵنیایەوە چەندین جار لە رالف

ویلسـون تانـەوە بیسـتوە کـە دەبێت بەرامبـەر بـە ناڕەحەتیـەکان بەرگـە بگرن.))

## پـوخـتـە:

کەسەکان هەندێ کات لە من دەپرسن کە نهێنی باش قسـەکردن چیییە؟ من هەمیشە لە وەڵامدا دەڵێم وتاردانێکی باش دەبێت بە پێکهێنـان و خـۆ ئامادەکردنێکی باش دەست پێ بکرێت. زیاتر لـە ٩٠٪ سـەرکەوتنی ئێـوە پەیوەندی بە پێکهێنان و خۆئامادە کردنەوە هەیە. کەواتە لە دوای چـەند خولـەك وتـاردان، ئامـادەبوانی کۆڕەکـە تـێ دەگـەن کـە خۆتـان تـا چـی ئاستێك ئامادە کردوە. بەم شێوەیە ئامادەبوان دەرەجەیـەکی بـاش یـان خـراپ بـە ئێـوە دەدەن. ئـەرکی ئێـوە ئەوەیـە تـا ئاسـتێکی بـاش و پێویست خۆتان ئامادە بکەن تا هەر لـەو کاتـەی یەکەمـەوە بەکەسـێکی بەهێز دەرکەون.

هـەواڵی خـۆش ئەوەیـە کـە هەرچـی زیـاتر خۆتـان ئامـادە بکـەن و وتارەکانتـان بـە جـوانی پێـك بهێـنن، کاتێـك لـە بەرامبـەر ئامادەبوانـدا ڕادەوەستن هەست بە باوڕبەخۆنێکی زۆر دەکەن. هەست بـە هێزێکـی زۆر دەکەن لە بەرامبەر بیسەراندا و هەست بە ئارامبونێکی زۆر دەکەن.



## بـەشـی سـێـیـەم



# باوڕبـەخۆبـون و زاڵ بـون بـەسـەر مـێـشـکـدا
## تـرس لە قسـەکـردن لـە بـەرامبـەر ئـامـادەبـوان لـە نـاو بـەرن

بە باشی بیر بکەنەوە، باوڕتان بە خۆتان هەبێت. بەم شێوەیە ژیان لە سـەلامەتی و ئـارامی زیـاتردا دەبینرێـت، و کـاراتر دەبـن و ئـەزمون و سەرکەوتنی زیاتر بە دەست دێنن.

"ئەدی ریکن بیکر"

مەبەسـتی ئێـوە لـە کـاتی وتاردانـدا ئەمەیـە کـە بـە باوڕبەخۆبونـەوە ڕابوەستن: بە باشی، ئارامی، بە هەسـتێکی باشـتر لـە بـارەی خۆتانـەوە، مەبەستی ئێوە ئەوەیە کە لە کاتی وتارداندا هەست بـە باشـی بکـەن یان هەسـتێکی باشـتان هـەبێت، هـەروەك ئـەوەی کـە لـە شـەوی جەژنـدا لـە تەنیشت ئەندامانی خێزانەکەتانەوە دانیشتبن.

لێرەدا چەند پرسیارێك دروست دەبێت: کە چـۆن دەتـوانن بـەم ئارامیـە بگەن؟ چۆن دەتـوانن بـە باوڕبەخۆبوونـەوە لـە بەرامبـەر هـەر کۆمەڵێکدا ڕاوەسـتن و قسـەبکەن؟ ئەمـە بابەتێکـە کەلـەم بەشـەدا باسـی دەکـەین و دەیخوێننەوە.

سەرەتا ئەوە بزانن کە ترسان لە بەرامبەر ئامادەبوواندا هەسـتێکی سـادەو ئاساییە، هەتا ئـەو وتاردەرانـەی کـە بـەناوبانگن و هـەزاران جار لەپشت

مێـزی وتاردانـەوە وەسـتاون، بـێ خـەم نـین و هەمیشـە دوودڵـن. (دیویـد نیون) ئەکتەری بیانی کە هەزاران جار لە سەر شانۆ دەرکەوتووە دەڵێـت: هەر جارێ کە دێمە سەر شانۆ هەست بە ترس و دوودڵی دەکەم.
هەندێ لە وتاردەرەکان دەڵێن ترسـی قسـەکردن لـە بەرامبـەر کۆمەڵێکدا زیاترە لە ترسی مردن. بەڵام بەوتەی هەمان وتـاردەران. هـەرگیز هەسـتی بێتاقەتی و دوودڵی بە بابەتێکی گرنگ دانانێن.

## هەموو ترسەکان داگیر کەرن:

هەواڵی خۆش ئەمەیە کـە منـداڵان دوور لـە تـرس لـە دایـك دەبـن. هـەموو ترسـەکان ئێـوە هـی سـەردەمی منـداڵی و هـەرزەکارین کـە ئێسـتاش کاریگـەری لـە سـەرتان مـاون. وزە خراپـەکان هـەم لـەلای خـەڵکان وهـەم لەلای خۆتان، زیاد دەبن.
بەڵام ئەو ترسانەی کە لە کاتی وتارداندا فێر بـوون، دەتـوانن بـە دووبـارە پێکهێنانەوە ترسەکان لە مێشکی خۆتاندا لەناو بەرن.
هۆکاری سەرەکی ترسی گەورەکان ئـەو ڕەخنـە ڕوخێنەرانـەی سـەردەمی منداڵیـە کـە لێیـان گـیراون. کاتێـك بـاوك و دایـك بەشـێوەیەکی وێرانکـەر ڕەخنە لە منداڵەکانیان دەگرن، منـداڵ لـە جـواب کردن و ڕەخنـەگرتنی ڕوخێنەر دەترسـێت. بـەبیروباوڕی هەنـدێك خـەڵك تـرس لـە جـواب کـردن دەبێتە هۆی هەستۆکیەکی لە ڕادەبەدەر لە قۆناغەکانی تری ژیاندا.
هەروەها دەروون ناسان دەڵێن مرۆڤەکان لە سـەردەمی منداڵیـدا بـێ بـەش دەبن لە هەموو مەسەلە فکـری و سـۆزیەکان، ئەمـە کاتێـك ڕوودەدات کـە دایك وباوکەکان بۆ پـەروەردە کردنـی منداڵەکانیان سـوز و خۆشەویسـتی وەك چیەکێك بەکار دێنن. واتە منداڵەکانیان لـە سـۆز وخۆشەویسـتی بـێ

بەش دەکەن، یان بەبێ هۆ ناز بە ئەوان دەدەن تا بتوانن ڕەفتاری نەشیاوی منداڵەکە ڕابگرن. لەئەنجامدا منداڵەکە بیر دەکاتەوەو تێ دەگات: ((تا کاتێك گوێڕایەڵی باوك ودایکم بکەم، لە هێمنی و خۆشیدا دەبم، بەڵام ئەگەر گوێڕایەڵی ئەوان نەبم ئەوا توشی کێشەو ناڕەحەتی دەبم.))

## منداڵ وگەنجە لەڕادەبەدەر هەستیارەکان:

منداڵێك کە ڕووبەڕووی ڕەخنە قورسەکان دەبێتەوە یا بێ بەش دەبێت لە سۆز وخۆشەویستی، دەگۆڕرێت بۆ گەنجێك کە نیگەرانە لە بیروبۆچوونی خەڵکان یان دەترسێت وا دەزانێت هەر پێشنیارو ڕەخنەیەك لە لایەن خەڵکیەوە ڕوخێنەرە، لە دەسکەوتەکانی خۆیاندا بەردەوام ترسیان هەیە.

زۆربەی خەڵکی لەوە دەترسن کە لەبەرامبەر کۆمەڵە کەسێکدا ڕاوەستن و وتاربدەن. ئەمە ترس و جواب کردنێکە کەمنداڵ پێشتر لە پێنج ساڵی دا ڕووبەڕووی بوەتەوە. بەڵام دەتوانن ئەم ترس و دڵەراوکێیە بگۆڕن بە ئارامی ولێهاتوی وباوڕبەخۆبوون.

زۆربەی وتاربێژە گەورەکانی ئەمڕۆ سەردەمانێك کە دەیان ویست وتار بدەن هەموو گیانیان دەلەرزی و زۆر بە ئاڵۆزی دەیان توانی قسە بکەن. ئەوان هەتا لە کۆڕە بچووکەکان یا کۆڕی کرێکارەکانیشدا جورئەت یان غیرەتی قسە کردنیان نەبوو. یەکێك لە هاوڕێکانی من کاتێك لە بەرامبەر هەزاران کەسدا بە باوڕبەخۆبونێکی زۆرەوە قسەی دەکرد، لە یەکەمین کۆڕی وتاردانیدا لە ترساندا میزی کرد بە خۆیداو پانتۆڵەکانی تەڕ کرد بەم شێوەیە ناچار بوو کە هۆڵەکە بەجێ بهێڵێت.

## به هەواڵی خۆتان دەست پێ بکەن:

وتاردان به باوڕبەخۆبون بۆ خەڵکان دەبێت به هەواڵێك دەست پێ بکات که دەتانەوێت وتارەکه به گوێی خەڵکی بگەیەنن. ئەم بابەته به تەواوی گرنگە.

کاتێك کەسێك به من دەڵێت که دەیەوێت خۆی بکات به وتاردەرێکی باش یەکەمین پرسیاری من لەوی دەکەم ئەمەیە ((بۆچی؟)) هۆکاری چیە که ئەم کەسە دەیەوێت ببێت به وتاردەر یان ئەو باسە چییە که دەیەوێت لەگەڵ خەڵکیدا باسی بکات؟

بەداخەوە لە زۆربەی بابەتەکاندا کەسەکان دەیانەوێت وتاردەرێکی سەرکەوتو بن بۆ ئەوەی بڕە پارەیەکی باش به دەست بێنن یان ببێته جێی باسی خەڵکان واته بۆ ناوبانگ. ئەوان بیریان لەو بابەتانه نەکردوەتەوه که دەیانەوێت قسەی لەسەر بکەن، تا ئەو شوێنەی من بزانم، ئەم کەسانه بەدەگمەنی له ڕادەی ناوەندی بەرزتر دەبنەوە. بەڵام ئەگەر بابەتێك هەیە که به دڵنیایەوە دەتانەوێت قسەی لەسەر بکەن، ئەو بابەته بۆ خەڵکی باس بکەیت، ڕێگەیەك دەدۆزنەوە بۆ ئەوەی ئەو بابەته به باشی بۆ خەڵکی باس بکەن.

## به تەواوی هێزەوه قسه بکەن:

چەند ساڵ لەمەو پێش قسەکانی ( والی ئامۆس )م بیست کەلەبوارێکدا مشت ومڕی لەگەڵ نەخوێندەوارێکدا دەکرد. ئەو بۆ به خوێندەوارکردنی نەخوێندەواران هەوڵێکی زۆری دەدا و خەرجیەکی زۆری دەکرد. کاتێك بۆ ٦٠٠ کەسی ئامادەبوو لە کۆڕەکەدا قسەی دەکرد، به تەواوی هێزەوه

قسەی دەکرد، ئەو بۆ فێربونی وتاردان بۆ هیچی خولێکی فێرکردن نەڕۆشتبوو بەڵام ڕاوبۆچونەکانی بە شێوەیەکی باش ڕێکخستبوو. ئەو گرنگی زۆری دەدا بە فێرکردنی بە تەمەنەکان بە تایبەتی قسەی بۆ دەکردن. بە ئەوانی دەگوت ئەگەر بتوانن خۆیان فێری خوێندنەوە و نوسین بکەن ئەوا لەگەڵ خوێندنەوەی هەرکتێبێکدا و نوسینی هەر شتێك ژیانیان دەگۆڕێت. لە کۆتای وتاردانەکەیدا هەموو ئامادەبوان بۆ نیشان دانی ڕێزی خۆیان بۆ ئەو لەسەر کورسیەکانیان هەستانەوە و دەستیان کرد بەستایش کردن وچەپڵەلێدان. ئەو بەتەواوی توانایەوە قسەی دەکرد بابەتی وتارەکەشی بابەتێك بوو کە بەتەواوی خەزو باوڕی پێی هەبوو.

## ئامادەبوانی کۆڕەکە لە تەنیشت ئێوەدان:

خاڵی دەست پێ کردنی سەرکەوتن بەسەر ترس وتوڕەیدا لەکاتی وتاردان بۆ هەموان، گرنگی لەم خاڵەدا ئەوەیە کاتێك لەبەرامبەر ئامادەبوانی کۆڕێکدا دەوستن و وتاردەدەن، هەموو ئامادەبوانی کۆڕەکە خوازیارن کە لە وتاردانەکەتاندا سەرکەوتوو بن ئەو بابەتەی کە هەڵتان بژاردووە بەجوانی پێشکەشی بکەن. زۆر هاوشێوەی ئەوەیە کە بۆ سینەما بڕۆن. تا ئێستا ڕویداوە کە بۆ سینەما بڕۆن وئاواتە خوازبن کە فلیمێکی خراپ یان ناخۆش لێبدەن و کاتەکەتان بە فیڕۆ بدەن؟ بەدڵنیایەوە کە نا، حەزتان لە کات بە فیڕۆ دان نییە. کاتێك کە بۆ سینەما دەڕۆن ئاواتە خوازن کە فلیمێکی باش و بە سودتان پێشکەش بکەن بۆ ئەوەی وەلامێك بێت بۆ ئەو کاتەی کە بە فیڕۆتان داوە هاتوون بۆ سەیری ئەم فلیمە. لە کاتی قسەکردنیشدا هەمان بابەت ڕاستە. ئامادەبوانی کۆڕەکە ئاگاو سەرنجیان لای ئێوەیە، هەموو ئەوان سەرکەوتنی ئێوەیان دەوێت

لەو بابەتەی کە پێشکەشی دەکەن. ئەوان هاتوون کە ئێوە دڵخۆش بکەن و ئێوەش بە بابەتە بە سودەکانتان سود بە ئامادەبوان یان بە ئەوان بگەیەنن. ئەوان بە دڵخۆشیەوە هاتوون بۆ ئەوەی سود لە بابەتەکەتان وەرگرن.

## چۆن باوڕ ودڵنیای بە دەست دەهێنن:

ڕێگای جۆراوجۆر هەیە کە دەتوانن بۆ سەرکەوتن بە سەر ترس ونیگەرانیەکانتان لە کاتی وتارداندا سودیان لێ وەرگرن. وتاردەرە بە ناوبانگەکان یان ناودارەکان سود لەم ڕێگایانە وەردەگرن.

## بە زمان هێنان:

لە ٩٥٪ی هەستەکانی ئێوە لەگەڵ ئەو قسانەی کە لەگەڵ خۆتاندا دەیکەن ڕوون دەبێتەوە. بە واتایەکی تر قسەیەك کە لەگەڵ خۆتدا دەیکەیت تا ڕادەیەکی زۆر خەیاڵ و هەست وهەنگاوەکانی ئێوە دروست دەکات. ئێوە لە ڕووی وشانێك کە لەلایەن مێشکەوە هوشیاریتان دەبێت کۆنترۆڵی تەواوتان هەیە.

بە هێزترین ووشانێك کە دەتوانن بۆ ئامادەکرنی مێشکی خۆتان بۆ وتاردانێك سودی لێ وەربگرن، ((خۆمم خۆشدەوێت ))ە.

پێش ئەوەی بۆ وتاردان کورسیەکانتان بەجێ بهێلن. چەند جار بە خۆتان بڵێن: (( من خۆمم خۆشدەوێت، من خۆمم خۆشدەوێت، من خۆمم خۆشدەوێت )) ئەم ووشانە کاریگەرییەکی سەرسوڕهێنەریان هەیە بۆ زۆر کردنی باوڕبەخۆبون و کەمکردنەوە و زاڵ بوون بەسەر ترسەکاندا. هەرچی زیاتر خۆتان خۆش بوێت، باوڕی زیاترتان بە خۆتان دەبێت،

هەرچی زیاتر خۆتان خۆشبوێت، هەست بە ئارامی زیاتر دەکەن. هەرچی زیاتر خۆتان خۆش بوێت، زۆربەی ئەو کەسانەتان خۆش دوێت کە وتاریان بۆ دەدەن. هەرچی زیاتر خۆتان خۆش بوێت، باشتر دەتوانن وتار بدەن.

کاتێك بە هەر هۆکارێك تورە دەبن یان ترستان هەیە، دەتوانن بە ووتنی ئە ووشانە ((دەتوانم ئەم ئیشە بکەم و سەرکەوتوو بم، دەتوانم ئەم ئیشە بکەم و سەرکەوتوو بم )) ترسەکانی خۆتان کەم بکەنەوە. ترس تورەی کاتێك دروست دەبێت کە ئێوە دەڵێن:((ناتوانم ئەم ئیشە بکەم و سەرکەوتوو بم تێیدا )). بەلأم کاتێك بلێین ئەم ئیشە دەتوانم بکەم و سەرکەوتوو دەبم، ئەوا هەستە خراپەکان و ترسەکانتان لەناو دەبەن.

کاتێك یەکەمین جارتانە کە ئەم شێوازە تاقی دەکەنەوە سەرتان سوڕ دەمێنێت لە ئەنجامە باشەکەی.

## وێنا کردن:

تەواوی بەرەو پێش چونەکانی ئێوە لە وتاردانـدا لەگەڵ باش بونی وێناکردنی مێشکی دروست دەبێت. کاتێك وێنەیەکی باش لە مێشکتاندا دروست دەکەن، کاتێك خۆتان دەبینن کە بە شێوەیەکی باش وتار دەدەن. مێشکی ئیوە هوشیاری ئێوە ئەمە وەك داخوازییەك قەبوڵ دەکات و دوای ووشەکان، هەستەکان وحاڵەتانێك لە ئێوەدا دروست دەبێت کە لەگەڵ وێنەی مێشکی خۆتاندا هاوشێوەن.

دەبێت خۆتان بەم شێوەیە ((ببینن)) کە بە ئارامی و، دڵنیایەوە لە بەردەم ئامادەبواندا بە زەردەخەنە خستنە سەر لێوەکانتان بۆ ئەوان قسە دەکەن. بزانن ئامادەبوان هۆگری ئێوە بوون، یان زەردەخەنە

دەکەن، سەرنجی یەك بە یەکی ووشەکانتان دەدەن. لە درێژەی باسەکەدا ئاماژەم بە دوو شێوە وێناکردن کردووە.

## وێنا کردنی دەرەکی و ناوەکی:

بە وێناکردنی دەرەکی ئێوە خۆتان لە سەر شانۆ دەبینن. وەك ئەوەی کە کەسی سێیەمن یان یەکێك لە ئامادەبوانی ناو کۆڕەکەن کە سەیر دەکەن. خۆتان دەبینن کە بە ئارامی وەستاون و باوڕبەخۆبونێکی باشتان هەیە. ڕێك و ڕاوەستن. لە ئارامیدا بەهرەمەندن. بەباشی قسە دەکەن. خۆتان دەبینن، هەر وەك ئەوەی کە کەسێکی تر بۆ سەیرکردن و گوێ گرتنی ئێوە ڕاوەستاوە وئێوە دەبینێت کە بۆ کۆمەڵێك وتار دەددەن. لە بارەی وێناکردنی ناوەکیشەوە ئێوە خۆتان و ئامادەبوان لەکۆڕەکەدا بە چاوەکانی خۆتان دەبینن. دەبینن کە ئامادەبوانی کۆڕەکە ڕەزامەندی بۆ ئێوە نیشان دەدەن.

دەتوانن بارودۆخی خۆتان لە دەرەوە و ناوەوە سەیر بکەن. سەرنجی هەردوو شێوازەکە بدەن. مێشکی نیوە هوشیاری ئێوە لەگەڵ خەیاڵەکان و هەستەکان کە دروست کراوە لەگەڵ وێنەکانی ئێوەدا ڕەزامەندی نیشان دەدات.

## پلان دانانی مێشکی:

ڕێگەیەکی تر بۆ بەدەست هێنانی باوڕبەخۆبوون و گەشتن بە ئارامی لە وتارداندا بۆ خەڵکان ئەمەیە کە پێش خەوی خۆتان وا هەست بکەن کە بە ئاسانی و جوانی تەواو بۆ کۆمەڵێك وتار دەدەن. مێشکی نیوە هوشیار بە

ئاسانی ئەم وێناکردنەی ئێوە قەبوڵ دەکات. باشترین کات بۆ پلان دانانی مێشکی پێش خەوتنە یان ماوەیەك دوای لە خەو هەستانە.

کاتێك لە خەودان، خۆتان ببینن کە بە جوانیەکی تەواو بۆ کۆمەڵێك وتار دەدەن. ئەم داخوازییە لە سەر مێشکی نیوە هوشیاری ئێوە کاریگەری دەبێت کاتێك کە دەخەون، کاریگەریەکی باشی لەسەر ئێوە دەبێت، هەرچی زۆرتر وێناکردن بکەن، باشتر دەتوانن لە کۆڕەکاندا بە وتاردەرێکی باش بێنەپێش چاو. ئەم ڕێگە تاقی کردنەوە مێشکیە زۆر بە هێزە.

## هەستەکان بەکاربهێنن:

ئەگەر وتاردەرێکی سەرکەوتو و ناودار بن، بە ئاسانی دەتوانن ئەو هەستە باشەی بەرچاوتان بەدەست بێنن. ئێوە دەتوانن ئەو هەستانەی کە پەیوەندی بە شادی، خۆشبەختی و شانازی و باوڕبەخۆبونەوە هەیەپێش لە وتاردان بەدیان بهێنن. وادای دەنێن کە وتارێکی زۆر باشتان داوە و ئێستا هەموویان ڕاوەستاون، زەردەخەنەیان لە سەر لێوە و چەپڵەتان بۆ لێدەدەن و ستایشتان دەکەن، دواتر باوڕ دەکەن کە هەستی زۆر باشتان بەرامبەر بە خۆتان هەیە لەو وتارە باشەی کە پێشکەشتان کردووە ڕازین.

کاتێك بە تەنهان، ئەم هەستانە بە هەمان شێوە دەرکی پێ بکەن کە ئەگەر وتاردێکی باشتان بدایە، هەستەکانتان دەنواند. ئەم هەستانە دروست بکەن وە ئەوان لەگەڵ ((من هەمیشە وتار بەباشی دەدەم)) ڕێك بخەن.

( ویلیام جیمز ) دەروون ناس و فەیلەسوفی بە ناوبانگ: (( باشترین ڕێگەی دەستکەوتنی هەستێك، پیشان دانی ئەم بابەتەیە کە ئێوە ئەم هەستەتان هەیە.))

یەکێك لە ڕێگە دڵ پێخۆشکەرەکان ڕێگەی ((کۆتای فیلمە)). بۆگەشتن بەم ڕێگەیە وا دابنێن کە بۆ سینەما هاتوون بۆ ئەوەی سەیری فلیمێك بکەن. بەڵام هەندێك زوو هاتون و فیلمی پێشتر هێشتا تەواو نەبوە. بەم شێوەیە دەچنە ناو هۆڵی سینەماکەوە. ١٠خولەکی کۆتای ئەم فیلمە سەیر دەکەن. دەزانن کە ئەنجامی ئەم فیلمە چییە هەموان لە کۆتای فیلمەکەدا بە داواکاریەکانیان دەگەن.

کاتێك فیلمەکە تەواو دەبێت، چەند خولەکێك بۆ کات بەسەر بردن دەڕۆنە هۆڵی چاوەڕوانیەوە تا ئەو کاتەی کە فیلمەکە دووبارە دەست پێ دەکاتەوە، کە دەستیان کرد بە پێشکەش کردنی فیلمە کە ئەو کاتە ئێوەش دەچنە ناو هۆڵی سەیر کردنی فیلمەکەوە و سەر لە نوێ سەیری فیلمەکە دەکەنەوە. بەڵام ئێستا دەزانن کە فیلمەکە ئەنجامەکەی چی دەبێت. کۆتایەکەی باش دەبێت ئێستا کە ئەنجامی فیلمەکە دەزانن، ئارامیەکی زۆرتان دەبێت، بەبێ ئەوەی هەست بە دوودڵی بکەن هەموو کاتەکانی فیلمەکە دەبینن. سەرەڕای ئەوەی کە دەزانن فیلمەکە ئەنجامێکی باشی هەیە.

لە ڕێگەی ((کۆتای فیلم ))لە وتارداندا سود وەرگرن. وا هەست بکەن کە بە کۆتای وتاردانەکە گەشتوون هەموویان وەستاون و چەپڵەتنان بۆ لێ دەدەن. وتاردانێکی باشتان پێشکەش کردووە. هەست بە دڵخۆشی دەکەن و شانازی بە خۆتانەوە دەکەن. هاوڕێکانتان لە ناو ئامادەبواندا

هەست بە دڵخۆشی دەکەن بە ڕەزامەندییەوە سەیری ئێوە دەکەن. ئێوە پێش ئەوەی وتارەکەتان دەست پێ بکەن، کۆتای ئەو دەبینن.
دەتوانن ئەم ڕێگەیە بە تەنها چەندین جار ڕاهێنانی لە سەر بکەن. لەوانەیە بە سەرسوڕمانەوە ئاگاداربینەوە کە وتاردانەکەتان بە شێوەیەك پێشکەش کردووە کە چاوەڕێی ئەو ئەنجامە باشەتان دەکرد.

ڕاستیخواز:

بەدۆزینەوەیەکی گرنگ گەشتوین: مێشکی نیوە هوشیاری ئێوە ناتوانێت لێکدانەوە بۆ ڕوداوێکی ڕاستی و ڕوداوێکی خەیاڵی بکات. بۆنمونە ئەگەر ئەزمونێکی سەرکەوتو و ڕاستتان هەبێت، مێشکی نیوە هوشیاری ئێوە ئەوە وەك سەرکەوتنێك تۆمار دەکات. ئەم ئەزمونە سەرکەوتوە باوڕبەخۆبونتان زیاد دەکات بە تایبەتی لە وتارداندا.
بەڵام ئەگەر ئەزمونێکی سەرکەوتو بێنەپێش چاوتان. تەنانەت ئەگەر تا ئێستا لە ئیشدا ئەزمونتان وەرنەگرتبێت. هەتا شوێنێك کە مێشکی نیوە هوشیاری ئێوە پەیوەندی دەبێت، ئێوە لە دنیای دەرەوەدا ئەم سەرکەوتنەتان بە دەست هێناوە. بەم شێوە ئەگەر ئەزمونی وتاردانی سەرکەوتوو بهێننە بەر چاو ئەو ١٠تا ٢٠ یان ٥٠ جار لە مێشکتاندا زیندوو بکەنەوە، ئەوا مێشکی نیوە هوشیاری ئێوە تۆماری دەکات کە ١٠تا ٢٠ یان ٥٠ جار لەو سەرکەوتنە ئاگادار کراونەتەوە.
کاتێك ئەم ڕێگەیە تاقی دەکەنەوە کاتی سەرکەوتن چەندین جار لە ئیشەکەتاندا وێناکردنی بۆ دەکەن، مێشکی نیوە هوشیاری ئێوە لە ئەنجامدا ئاگادار دەبێتەوە کە لە پیشەی قسەکردندا باشترن، لە ئارامی و باوڕبەخۆبوندا دەمێننەوە و دەتوانن وەك وتاردەرێکی ناودار وتار بدەن.

## بەدیهێنانی باوڕبەخۆبون لە کۆتا خولەك دا:

گەورەترین بەش پێکهێنانی مێشکە بۆ وتاردان لە بەرامبەر خەڵکدا دەتوانرێت لە ماوەکانی پێشدا ئەنجامی بدەن. بەڵام وتاردەران دەتوانن ئەو ئیشانەی کە ماویانە لەماوەی ئەو چەند خولەکەی کە ماوە بۆ دەست پێ کردنی وتاردان جێ بەجێیان بکەن کە لەسەر ئیشەکەیان و بەهێزی وتاردانەکەیان کاریگەری دەبێت.

## ژورەکە بپشکنن:

کاتێك سەرەی وتاردانی ئێوە دەگات، کەمێك پێشتر بۆ هۆڵی وتاردانەکە بڕێن وهۆڵەکە بپشکنن. بڕۆنە لای مێزی وتاردان و هەندێ ڕاوەستن و ئەوشوێنەی کە گونجاو بۆ وتاردان هەڵیبژێرن. لەگەڵ هەندێك لەو کەسانەی کە بە زۆری دێن بۆ هۆڵی وتاردان قسە بکەن. لەوان بپرسن کە خەڵکی کوێن و ئیشیان چیییە؟ ناویان بپرسن وناوی خۆتانیان پێ بڵێن. هەرچی زیاتر لەگەڵ بەشداربواندا قسە بکەن، لە ئارامی زیاتردا دەبن. وا هەست دەکەن کە لەناو کۆمەڵێ لە هاوڕێکانتاندان.

## بۆمانەوە لە ئارامی و ئاسایشدا ڕاهێنانی هەناسەدان بکەن:

• باشترین ڕێگەی هەناسەدان ئەو ڕێگەیەیە کە من ناوم ناوە (٧×٧×٧). دەبێت هەناسەی قوڵ هەڵمژن _هەرچی قوڵتر باشتر. هەڵمژینی هەوا بۆ ناو سیەکانتان دەبێت بە ژمارە بێت، دواتر بە ئەندازەی ژمارەدنی ١ تا ٧ هەناسە لە ناو سیەکانتاندا بهێڵنەوە دوای هێشتنەوە بە ژمارەدنی ١ تا ٧ هەوای ناو سیەکانتان بکەنە دەرەوە.

ئەم ڕاهێنانی هەناسەدان و هەناسە دانەوە ٧ جار دووبارە بکەنەوە. بەم ڕاهێنانە مێشکتان لە بارودۆخێکی ئارامدا دەمێنێتەوە، بیرۆکەکانتان ڕۆشن دەبێنەوە و تورەیتان نامێنێت و هێمن دەبنەوە و وتاردانێکی باش پێشکەش دەکەن.

## خۆتان ببوژێنەوە:

ڕێك پێش ئەوەی بناسرێیت، بە خۆتان بڵێن: (( ئەمە قسەکردنێکی زۆر باش دەبێت. بۆ ئەم وتاردانە بێ هێزەم. ئەم وتاردانە. )) لەگەڵ خۆتاندا ئەمە دووبارە بکەنەوە: ((من خۆمم خۆش دەوێت، من خۆمم خۆش دەوێت، من خۆمم خۆش دەوێت. ))

لە کاتی بەجێ هێنانی ئەم ووشانەدا هەستەکانتان بەکاربهێنن. کاتێك کە دەتانەوێت کەسێك ڕازی بکەن کە زۆر دڵنیان لە ووشەکانی خۆتان. هەرچی بەهەستێکی زیاترەوە لەگەڵ خۆتاندا قسە بکەن، کاریگەریەکی باشتر بەجێ دێڵن و مێشکی نیوە هوشیاری ئێوە ئەوە باوڕ دەکات.

## پەنجەکانی پێتان بجوڵێنن:

ڕێگەیەکی باش بۆ زیادکردنی باوڕبەخۆبون و کەم کردنەوەی ترسەکانتان ئەمەیە کە پێش دەست کردن بە وتاردان پەنجەکانی پێتان بجوڵێنن، کاتێك دڵخۆش و بە کەیفن، بە تایبەتی لە سەردەمی منداڵیدا، پەنجەکانی پێتان دەجوڵێنن. کاتێك پێش لە وتاردان ئەم ئیشە بکەن، بە ئێوە حەزێکی زیاتر دەدات و زەردەخەنەیەك لە سەر لێوەکانتان دەنێت تا بە هەستی دڵخۆشی بگەن. ئاگاداربن ئیشەکان و هەستەکانی ئێوە هۆکار دەبن، ڕێك بە هەمان شێوە هەستەکان و ئیشەکانی ئێوە شکڵ دەدەن.

## شانەكانتان بجولێنن:

لەو شوێنەوەی كە بەشی گەورەی فشاری ڕۆحی لە سەر بازوەكان و پشت و شانەكانتان كاریگەری دەبێت، پێش لە دەست كردن وباس كردنی وتارەكەتان چەند جار شانەكانتان بجولێنن و بسورێنن. دەستەكانتان بجولێنن و دەستەكانتان بە شێوەیەكی شل نیشان بدەن. ئەم هەنگاوە لە فشاری ڕۆحیتان كەم دەكاتەوە و ترسەكانتان كەم دەكاتەوە یان هەر نایهێلێت و دوودلێشتان لە ناو دەبات. كاتێك هەموو ئەم خالانە_هەلمژینی هەناسەیەكی قول، جولاندنی شانەكانتان، جولاندنی دەستەكانتان وپەنجەكانی پێتان بەیەكەوە ڕێك بخەن بە حالەتی ئارامی ودلخۆشی دەگەن و خولیای وتاردان دەبن.

## ڕێك و ڕاست بوەستن:

كاتێك بۆ وتاردان ڕادەوەستن، سەرتان بۆ سەرەوە بە شێوەیەكی ڕاست بوەستێنن. وا هەست بكەن كەپەتێك لە سەقفی هۆلەكەوە بۆ سەر سەرتان ڕاكێشراوە. بە ڕێك و ڕاست وەستان دەتوانن هەست بە باوڕبەخۆبونی زیاتر بكەن.

## بیر لە ئامادەبوانی كۆڕەكە بكەنەوە:

ڕێگەیەك بدۆزنەوە تا بە بەراورد لەگەل كەسانێك كە بۆ بیستنی وتارەكەی ئێوە هاتون هەست بە هێزێكی زۆر بكەن. بۆ نمونە پێش لەباس كردنی وتارەكە وا بیهێننە پێش چاو كە ئامادەبوانی كۆڕەكە پارەی ئێوە قەرزارن و ئێستا هەموویان بۆ لای ئێوە هاتون و تا بلێن ماوەی دانەوەی قەرزەكەتان بۆ ماوەیەكی دواتر درێژ بكەنەوە.

دەتوانن وا هەست بکەن کە بەشداربوانی کۆڕەکە لە وتاردانەکەی ئێوەدا بە جل وبەرگی ماڵەوە دانیشتون و گوێ بۆ وتارەکەی ئێوە دەگرن. بەم شێوەیە دەتوانن دڵی خۆتان خۆش بکەن و زەردەخەنەیەك بکەن ولە فشاری ڕۆحی خۆتان ڕزگار بکەن، لە ئەنجامدا وتارێکی کاریگەر بدەن.

## سوپاسگوزار بن:

ڕێگەیەکی باش بۆ زیادکردنی باوڕبەخۆبون لە کاتی وتاردانـدا، سوپاسگوزار بن لەوەی کە ئەم هەلەیان پێ داون بۆ وتاردان. بە خۆتان بڵێن: ((سوپاسگوزارم کە ئەم هەلەتان بە من دا بۆ ئەوەی وتار بۆ ئێوە و ئامادەبوان بدەم، دووبارە سوپاسگوزارم، سوپاسگوزارم و سوپاسگوزارم. )) بە خۆتان بڵێن: ((من ئامادەبوانی کۆڕەکەم خۆش دەوێت. من ئامادەبوانی کۆڕەکەم خۆش دەوێت.))

وتاردەرە ناودارەکان بە بابەتی (( نمرەی مێزی وتاردان )) ئاشنان. کاتێك بۆ وتاردان لە پشتی مێزی وتاردانەوە دەوەستن، هەمیشە بیر لەوە بکەنەوە کە شایەنی چی دەرەجەیەکن کە بۆ کەسە ناودار یان ناسراوەکان وتار دەدەن. هەرچی زیاتر سوپاسگوزار بن لە بری ئەوەی کە ئەم هەلەیان پێ داون بۆ وتاردان، زیاتر لە وتارەکەتان و ووشەکانتان چێژ وەردەگرن.

هەرچی زیاتر کەسە ئامادەبوانی کۆڕەکەتان خۆش بوێت، ئێوەش زیاتر هەست بەوە دەکەن کە ئامادەبوانیش زیاتر ئێوەیان خۆش دەوێت، بەم شێوەیە بە ئارامیەکی زیاتر دەگەن.

## بابەتەکە سەبارەت بە ئێوە نیە:

وە لە ئەنجامدا سەرنجی ئەم بابەتە بدەن کە بابەتەکە پەیوەندی بە ئێوەوە نییە، بێ مانا بیر مەکەنەوە کە ئەوان لە بارەی ئێوەوە چی بیرێك دەکەنەوە. لە بری ئەم بیر کردنەوەیە بیر لە ئامادەبوان بکەنەوە.

هاورێم (کاوت ڕۆبرت) دامەزرێنەری کۆمەڵەی وتاردەرانی نەتەوەیە، کە کەسایەتیەکی زۆر بەناوبانگە سەردەمێك بە منی ووت کە ئەو کاتە وتاردەرێکی گەنج بوو. بەپەلە خۆی دەگەیاندە سەر شانۆ تا ((من هاتم)) بە ئامادەبوانی کۆڕەکە ڕابگەیەنێت. ئەو دەیگوت کاتێك کە بوو بە وتاردەرێکی باش بیرۆکەکەی خۆی گۆڕا. واتە لە بری ئەوەی کە بڵێت:((من هاتم )) بە پەلە دەهات و دەیگوت: ((زۆر باشە، ئێوە هەمووتان ئامادەن.))

کاتێك کە ئامادەبوانی کۆڕەکەتان زیاتر خۆش دەوێت و ڕێزیان لێ دەگرن حەزتان لە ئامادە بونیانە، کاتێك ئەوان بە گەرم و گوڕ و هاوڕێ دەزانن، ترس و دوودڵیەکانتان دەڕەوێتەوە.

## پوختە:

ئامادەی مێشکی وەك ئامادەی جەستەیە. بۆ گەشتن بە هەر دوو ئامادەییەکە پێویستتان بە ڕاهێنانی زیاتر هەیە. کاتێك پێش لە وتاردان بە داخوازییەکی کتێبەکان ئیش دەکەن. بە خێرای بە ئارامی و باوڕبەخۆبوون دەگەن و کونترۆڵی بەرنامەی وتاردانەکە دەکەن.

## بــەشـــی چــوارەم



## لــە بــەرامــبــەر هــەمــوو بیســەرانــدا بــەهێــز بێنــە پێش چاو

دەست پــێ کردنــی هــەر ئیشــێك بەتایبــەتی بــۆ چــیینی گــەنجان و بەشداربووە تازەکان گرنگترین بەشی ئەو کارەیە چونکە ئەمە کاتێکە کە کەسایەتی تێدا دروست دەبێت کاریگەرییەکی گەورەی دەبێت.

"ئەفلاتون"

بە دڵنیایەوە ئێوەش بیستوتانە کــە دەڵێن:((کاریگەرییــە ســەرەتاییەکان دەمێننەوە بەردەوام دەبن. لە کاتەکانی دواتر هەلی واتان بــۆ ناڕەخسێت کە هێندەی بە دەست هێنانی هەلی یەکەم کاریگەری هەبێت.))

کاتێــك قســەکانتان دەســت پــێ ئەکــەن، دەبێــت هــەوڵ بــدەن یەکــەمین کاریگەری کە لەسەر بیســەرانی خۆتــان دایــدەنێن بــاش و ســەرنج ڕاکێش بێت. ئەم هەنگاوە لە سەر پێشوازی کردنی ئەوان زیاتر دەبێت بۆ ئــەوەی باشتر گوێ بۆ قسەکانی ئێوە بگرن.

### ناساندنی ئێوە:

ئەگەر پێش لە وتاردانتان کەسێك ئێــوە بــەئامادەبوان دەناســێنێت، ئــەم ئیشــە بــارودۆخی وتاردانەکــە دەگونجێنێــت. ئامــانج لــە ناســاندن ئەمەیــە کەچاوەڕوانیەکی باش لەئامادەبوانــدا دروســت ببێــت. ئامــانج ئەمەیــە کــە

بیسەران مێشكیان ئامادە بكەن بۆ ئەوەی گوێ بۆ قسەكانتان بگرن. لە بەر ئەمە دەبێت بە وردی بەشی ناساندن لە پێشدا بە جوانی پێشكەش بكرێت.

بۆ پێشەكیەكی باش و كاریگەر دەبێت پشت بە قسەكانی خۆتان ببەستن وسود لە قسەكانی خۆتان وەربگرن. دوای بابەتەكە وەك وتاردەرێك ئێوە ڕادەكێشێت. بە سەرنجدان بە ناونیشانی وتارەكە. پێشەكیەكەی ئێوە دەتوانێت كورت و پوخت بێت.

با لێرەدا نمونەیەك بهێنمەوە:((وتاردەری ئەمشەوی ئێمە ٢٢چالاكی ئابوری باس كرد لە ٨ ڕێكخراوی بازرگانیدا زیاتر لەیەك ملیۆن دۆلاری دەسكەوت هەبووە. ئەمڕۆ ئەوان بۆمان باس دەكەن كە چۆن دەتوانین لە ئیشی بازرگانیدا سەركەوتوو بین. تكایە چەپڵەیەكی بەهێز بۆ بەڕێز (برایان تریسی) لێبدەن.))

ناساندنی زیاتر دەتوانێت وردەكاری زیاتر لە بارەی بەسەرهات وسەركەوتنەكانی وتاردەر نیشان بدات. ئامانج ئەمەیە كە سەرنجی ئامادەبوانی كۆڕەكە ڕابكێشیت و ئەوان لە چاوەڕوانی دەست پێ كردنی وتارەكە بێنیتەدەرەوە.

## دوای ناساندن:

لەنێوان كۆتای ناساندن و دەست پێ كردنی وتارەكەتان، ئیشە جیاوازەكان شێوەیەكی لاوەكی پەیدا بكات، لە ڕووەوە كاتێك كە دەچیەنە سەرشانۆ (مەسرەح)، دەبێت سەرنجی ئەم پێنج بابەتە بدەن. ئەم پێنج بابەتە یان خاڵە یارمەتی ئێوە دەدات كە كاریگەری زیاترتان لەسەر بیسەران و ئامادەبوانی كۆڕەكە هەبێت.

## بە دڵنیایەوە بڕۆنە سەر شانۆ (مەسرەح):

دوای ئەوەی کە ناسران، بڕۆنە سەر شانۆ (مەسرەح) و لەگەڵ ئەو کەسەی کە ئێوەی ناساندوە تەوقە بکەن و سپاسگوزاری بن، چاوەڕێ بکەن تا کەسە ناسێنەرەکە لە سەر شانۆ (مەسرەحەکە) بڕواتە خوارەوە و دواتر سەیری ئامادەبوانی کۆڕەکە بکەن.

دواتر بۆ ماوەیەکی کەم بێدەنگ بن بۆ ئەوەی بیسەران یان ئامادەبوان گوێ گرتنی قسەکانتان بن.

زەردەخەنەیەك بکەن و سەیری تەواوی هۆڵی وتاردانەکە بکەن. وانیشانی بدەن کە بەبینینی هەموو بیسەران و ئامادەبونیان لەم کۆڕەدا زۆر دڵخۆشن.

لە کاتێکدا کە بێدەنگ دەبن و زەردەخەنەیەك دەخەنە سەر لێوەکانتان، ئامادەبوانی کۆڕەکە وردە وردە بێدەنگ دەبن، ئاگادار دەبنەوەو چاوەڕێی ئەوە دەکەن کە ئێوە وتارەکەتان دەست پێ بکەن. کاتێك کە دەنگە دەنگی هۆڵەکە تەواو بوو و هەموان بێدەنگ بون، قسەکانی سەرەتای خۆتان بە دەنگێکی خۆش و سەرنج ڕاکێشەرانە دەست پێ بکەن. ئەم قسە سەرەتایانە دەبێت پلە بەپلەو بەبێ دەس کاری وتارەکەتان بێت دواتر تێ دەگەن کە بە کۆتای قسەکانتان گەشتوون.

## ڕواڵەتێکی جوانتان هەبێت:

یاسا لێرەدا ئەوەیە شتێك لە جل وبەرگ یان جوانکاریتاندا نابێت ببێتە هۆی ئەوەی سەرنج ڕاکێشان کە بیسەران پێیەوە سەرقاڵ بن وئاگایان لە قسەکانی ئێوە نەمێنێت. بیسەران و ئامادەبوان لە ۳۰ چرکەی

سەرەتادا بڕیار لەسەر وتاردانەکەتان دەدەن. بە هەمان هۆکار لەش ولاری ئێوە، جل وبەرگ وشێوەی جوانکاریتان ڕۆڵێکی زۆر گرنگ دەبینێت.

شێوەی ڕواڵەتتان روونی دەکاتەوە کە چۆن بیر دەکەنەوە و لە بارەی خۆتانەوە چی هەستێکتان هەیە. ئەم دۆخە وێنەی مێشکی ئێوەیە. شیوەی ڕواڵەتتان لەهەمان کاتیشدا بە ئامادەبوان دەڵێت کە لەبارەی ئەوانەوە چی هەستێکتان هەیە و لە بارەیانەوە چۆن بیر دەکەنەوە. زۆربەی وتاردەرەکان وابیر دەکەنەوە کە لە کاتی وتارداندا دەبێت جلو بەرگی ماڵەوە لەبەر بکەن. ئەمەش وەك ئەوە وایە کە تا چەند خولەکێك لە باخچەیەی ماڵەوەیاندا ئیشیان کردبێت. بەڵام ڕاو بیرکردنەوەی ئامادەبوان و بیسەران لەم شێوە جلوبەرگ لەبەر کردنە ئەوەیە کە ئێوە نە ڕێز بۆخۆتان و نە بۆ ئامادەبوانی کۆڕەکە دادەنێن. ئەم شێوە جلوبەرگ لەبەرکردنە لە بەهای ئەو قسانەی کە دەیکەن کەم دەکاتەوە ئەگەر قسەکانیشتان زۆر کاریگەروو بەهێزبن.

چەندین جار ڕووی داوە کە بانگهێشتکەرانی من کۆڕی ساڵانەیان لە شوێنە جوان و گەشتیارەکان لە باشوورو ڕۆژئاوادا ڕێکخستوە. ئەوان لە بەشداربوانیان دەوێت کە جلوبەرگی وەرزشی لەبەربکەن و بەو شێوە جلوبەرگانەوە ئامادە بن. بۆ منیش هەمان قسەیان کردووە کە دەبێت منیش وەك ئامادەبوان بەو جلوبەرگانەوە ئامادە بم. بەڵام من هەمیشە بە جاوبەرگی تایبەتی لە کۆڕی وتارداندا ئامادەبم و باوڕم وایە کە جلوبەرگی وتاردەر دەبێت لە جلوبەرگی بیسەران و ئامادەبوان باشتر بێت.

## چاوەڕوانی باش دروست بکەن:

یەکەمین ئیشی ئێوە دەبێت ئەمە بێت کە ئاستی چاوەڕوانیتان بەرز بکەنەوە. دەتانەوێت ئیشێك بکەن بیسەرانێك بۆ بەشداری لە وتاردانی ئێوەدا هاتوون، لە هاتنیان ڕازی بن، ئاگادار بن هەموو بەشداربووانی وتارەکەتان سەرکەوتنی ئێوەیان دەوێت. ئەوان هاودەنگانە دەیانەوێت وتارێکی باش پێشکەش بکەن.

زۆر گرنگە کە بیسەران لە هەمان کاتدا حەزیان لە وتاردانەکەی ئێوە بێت. هەرچی لەلای ئەوان خۆشەویست تر بێنی پێش چاو، ئەوان باشتر پێشوازی لە قسەکانتان دەکەن و باشتر گوێتان بۆ دەگرن.

## بەبێ دواکەوتن چارەسەری ڕوداوەکە بکەن:

کاتێك بۆ قسەکردن لەپشتی مێزی وتارداندا دەوەستن، وەك سەرۆکێك دەردەکەون. ئەو کەسانەی کە لەکۆڕەکەی ئێوەدا هەن، دەیانەوێت ئێوە ڕەوتی وتاردانەکە کونترۆڵ بکەن، حەز دەکەن کە چارەسەری ڕوداوەکە بکەن. بەشێوەیەك ڕەفتار یان هەڵسوکەوت بکەن کە وەك ئەوە وابێ ژووری خۆتانە، یان هەروەك ئەوە وابێ هەموویان ئیش بۆ ئێوە دەکەن ولە ژێر ئەمری ئێوەدان.

دوای ئێوە کە ناسێنران، بڕۆنە سەر شانۆ بۆ باسکردنی وتارەکە، شانەکانتان بە ڕێکوپێکی و بۆ سەرەوە ببەن. پێبکەنن و باوڕتان بە خۆتان هەبێت. چاوەکانتان بە کراوەی بهێڵنەوە بۆ ئەوەی بیسەران هەست بە باوڕبەخۆبونتان بکەن.

كاتێك دەست بە وتاردان دەكەن، بە وردی سەیری یەكێك لە ئامادەبوان بكەن و قسەكانتان بە گەرم و گوڕییەوە بكەن، دواتر لە سەیر كردنی یەكێكەوە بۆ یەكێكی تر بڕۆن، ئەم پەیوەندییە ڕاستەوخۆی چاوییە، ئارامی بە ئێوە دەدات تا وتاردانەكەی خۆتان بەباشترین شێوە باس بكەن.

## ڕەسەنی و سادەو ساكاری خۆتان نیشان بدەن:

بۆ ئەوەی ئێویان خۆشبوێت، دەبێت سادەی و ساكاری خۆتان نیشان بدەن و بە باشی قسە بكەن. لەوانەیە بكەونە ژێر كاریگەری ئەو سەرنجدانە باشەی كە ئامادەبوانی كۆڕەكە بۆ ئێوەیان هەیە. هەندێك شەرم بكەن. زەردەخەنەیەك بكەن و چاوەكانتان لەسەر ئامادەبوان بجولێنن.

ئەگەر دەتانەوێت ڕەسەنی و سادەی وساكاری خۆتان نیشان بدەن، وەك كەسێك كە هەموو شتێك بزانێ خۆتان نیشان مەدەن. خۆتان زاناتر لە هەموان مەزانن.

## پێڕستە درێژەكانی ڕێگای وتاردانێك:

ئێستا كە بونەتە جێگای سەیركردنی بیسەران، چۆن تۆپەكەتان هەڵدەسوڕێنن؟ بە ڕێگە جیاوازەكان دەتوانن وتاردانە بەسودەكەی خۆتان دەست پێ بكەن.

### لە ڕێكخەرانی وتاردان سوپاسگوزار بن:

دەتوانن لە بەرامبەر بیسەران و ڕێكخەرانی كۆڕی وتاردانەكە سپاسگوزاری بكەن، بەو كەسەی ئێوەی ناساندوە ئاماژە بكەن یان بۆ

ئەو کەسانەی کە ئێوەیان بانگهێشت کردووە، هەروەها ئاماژەش بە کەسە سەرەکیەکان یان کەسە ناودارەکانی کۆڕەکەش بکەن. بە شێوازێك قسە بکەن کە هەست بەخۆشی و شانازی بکەن. بەم شێوەیە ئەوان لەوەی کە ئێوەیان بانگهێشت کردووە خۆشحاڵ دەبن.

## بە دەستەواژە و ڕستە باشەکان دەست پێ بکەن:

ئامادەبوانی کۆڕەکە دڵنیا بکەنەوە کە لە قسەو وتارەکەتان سود وەردەگرن. بۆ نمونە بڵێن: ((لە بەرنامەکەی ئەمشەو کە بە سوتفە بەشداریمان کردووە سود وەردەگرن. دەمەوێت لە بارەی هەندێك لە گرنگترین بۆچوونەکانم کە لەم بوارەدا هەمە قسە بکەم.))

## باسی ئامادەبوانی کۆڕەکە بکەن:

دەتوانن لە بەشداربوانی کۆڕی وتاردانەکە سوپاسگوزاربن و بەڕێزەوە لە بارەیانەوە قسە بکەن. زەردەخەنەیەك بکەن، لەبەر ئەوەی بیسەران یان ئامادەبوان هەست بەوە بکەن کە ئێوە لە ئامادە بونی ئەوان خۆشحاڵن. بە شێوازێك هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەن هەروەك ئەوەی کە هاوڕێیانی کۆنی خۆتانن و دوای ماوەیەکی زۆر ئێستا دەیان بیننەوە.

دەتوانن بە ئەوان بڵێن کە ئامادەبونیان و بینینیان لە کۆڕەکەدا دەبێتە شانازی بۆ ئێوە. دەتوانن پێیان بڵێن کە لەلای ئێوە ناودارترین و گرنگترین کەسانن وە هەروەها لە بارەی گرنگترین بابەتیشەوە قسەیان لەگەڵدا دەکەن. دەتوانن بە ئەوان بڵێن کە لە ١٠٪ی زیاتری ئەو کەسانەن کە لەم بوارەدا ئیش دەکەن.

## ئامادەبوانی کۆڕەکە خۆشحاڵ بکەن:

زۆربەی کات بۆ کۆمەڵێك لە کارمەندان کە قسە دەکەم، دەستپێکی قسەکانم بەم شێوەیە دەبێت: ((لەوەی کە منتان بانگهێشت کردووە بۆ وتاردان بۆ ئێوە سوپاسگوزارم و زۆر خۆشحاڵم، بە منیان گوت بڕیارە ئەمڕۆ بۆ کەسانێك قسە بکەم کە ملیۆنلەرو دەوڵەمەندن. ))

کاتێك ئەم قسە دەکەم، بۆ ماوەیەك بێدەنگ دەبم. پێدەکەنم و سەیری دەموچاوی ئامادەبوانی کۆڕەکە دەکەم. لە ڕاستیدا هەلێك بە ئەوان دەدەم کە قسەکانی من لەقوڵای دڵیاندا لێکبدەنەوەو لێیتێبگەن. دواتر بەردەوام دەبم لەسەر قسەکانم، ((بەو جۆرەی کە هەڵسەنگاندنم بۆ کردووە، ئامادەبوانی کۆڕەکە یان ملیۆنلەرەکانن یان لە داهاتودا بەم شێوەیان لێدێت. ))

بەم شێوە قسەکردنە هەموو ئەوان زەردەخەنەیەك دەکەن و خۆشحاڵ دەبن و بۆ قسەکانی ئێوە گوێ دەگرن.

## بە ڕووداوە ڕوونەکان ئاماژە بکەن:

بۆ دڵنیا بوون لە قسەکانی خۆتان ئەو ڕووداوانەی کە لە کۆتاییدا ڕوویان داوە ئاماژە بکەن و باسیان بکەن.

## بە یەکێك لە ڕووداوەکانی مێژوو ئاماژە بکەن و باسی بکەن:

ساڵانێك لەمەوبەر مێژووی شەڕەکانم خوێندوەتەوە. بە تایبەتی چیارەنوسی جەنەڕاڵ یان ژەنەڕاڵە گەورەکانم خوێندوەتەوە و جەنگە گەورەکانی ئەوانم لە بیر ماوە. یەکێك لە جەنەڕاڵە گەورانەی کە من لەسەریم خوێندوەتەوە حەزم لێی بووە ئەسکەندەری گەورەیە. من

چەندین جار بۆ بەهێز کردنی وتارەکەم و کاریگەر بوونی باسی ئەم کەسایەتیە گەورەیەم کردووە و ناوم هێناوە، داوام لە ئامادەبوانی کۆڕەکە کردووە کە بۆ چالاك کردنی بازرگانی سود لەو ڕێگایە ببینن کە ئەو بەکاری هێناون.

## بە یەکێك لە کەسایەتیە ناودارەکان ئاماژە بکەن:

دەتوانن لە دەست پێکردنی وتارەکەتاندا سود لە کەسایەتیەکی ناودار وەربگرن و وتەیەك لە وتەکانی ئەوان بۆ ئامادەبوان بڵێن یان باسی بکەن. سەرنجی ئەم نمونەیەی خوارەوە بدەن:

ئەمڕۆ دەمەوێت ڕوونی بکەمەوە کە بۆچی هەندێك کەس زیاتر لەوانی تر دەسکەوتیان هەیە. گری بکەر ئابوریانە براوەی خەڵاتی نۆبڵ بوو لە کۆتاییدا لە شوێنێکدا نوسی تەقریبەن هەموو نادادپەروەییە دەستکەوتەکان نادادپەروەری زانست وجیاوازی لێزانیە یان کارامەییە. لە چەند خولەکی دواتردا نیشانتان دەدەم کە چۆن دەتوانن زانست و کارامەی بۆ کەم کردنەوەی ئەم شێوازە بەکاربهێنن بۆ ئەوەی لە ژیانی خۆتاندا چەندین ساڵ پێشکەون.

سەرنجی نمونەیەکی تر بدەن: یەکێك لە بابەتەکان کە زۆر کات ئاماژەی پێدەکەم، گرنگی گەشەکردن پەیوەندی بە لێزانی کەسیەوە هەیە. هەروەك دوای ئەونمونەیە دەڵێم: (( لە سەدەی بیستویەکەم زانست و کارامەی وزانیاری کلیلی سەرکەوتنن. بە هەمان شێوەی کە پت ریلی ڕاهێنەری سەلەیە دەڵێت: (( ئەگەر باشتر نەبیت، ئەوا خراپتر دەبیت.))

## گفتوگۆیەك كە لە كۆتاییدا هەتان بوو دوبارەی بكەنەوە:

لە بارەی گفتوگۆیەك كە لە كۆتاییدا قسەتان لەگەڵ كەسێكدا كردووە قسە بكەن. بۆ نمونە بڵێن: (( چەند خولەكێك لەمەو پێش لەگەڵ تام رابینسون لە ناو هوتێلەكەدا قسەم دەكرد. ئەو دەیگوت ئێستا یەكێك لە باشترین سەردەمانێكە كە دەتوانرێت لەم پیشەدا ئیش بكرێت من بۆچوونەكەی ئەو تەئكید دەكەمەوە.))

## قسەی بزوێنەر بكەن:

دەتوانن باسەكەی خۆتان بە قسەی بزوێنەردەست پێ بكەن. بۆ نمونە دەتوانن بڵێن:(( بە پشت بەستن بە لێكۆڵینەوەی كۆتای كە بەم شێوەیە، گۆڕانكاری لەساڵی داهاتوودا، پێشبڕكێو هەلی گونجاوی زیاتر لەم پیشەیەدا شێوەی بیانی پەیدا دەكات كە لەمەو پێش نەبووە. ٧٢٪ی ئەوكەسانەی كە ئێستا لەم كۆڕەدا ئامادەن، لە ماوەی دوو ساڵی كەدا بە ئیشێكی تر جگە لەم ئیشەكەی خۆیان كە تا ئێستا دەیكەن سەر قاڵ دەبن بە مەرجی ئەوەی خۆیان لەگەڵ گۆڕانكارییەكاندا بگونجێنن.))

## ئاماژە بە لێكۆڵینەوە تازەكان بكەن:

دەتوانن ئاماژە بكەن بەولێكۆڵینەوە كۆتایەی كە كراوە. وەك ئەم نمونەیە: (( بە پشت بەستن بە كۆتا گۆڤاری بی زینس ویگ، لە ساڵی ٢٠٠٧دا ژمارەی ملیۆنلەرەكانی وڵات كە زۆربەیان خۆیان پێ گەیاندووە ٩، ٠٠٠، ٠٠٠ كەس بوو ئەم ژمارەیە تا ساڵی ٢٠١٥بە دووئەوەندە زیاد دەكات. ))

## هیوا بە ئامادەبوانی کۆڕەکە بدەن:

(گوستاو لوبو) فەیلەسوفی فەڕانسە سەردەمێك نوسی: (( شتێك زۆر تر وباشتر لە هیوا بونی نیەوە بونیشی نابێت. ))

کاتێك بە شێوەیەکی کاریگەر قسە دەکەن، بە شێوەیەك کە هیوا بە خەڵکی دەدەن. لە بیرتان بێت کە ئامانجی سەرەکی قسەکردنی ئێوە بۆ خەڵکی ئەوەیە کە ئلهام بە ئەوان ببەخشن بۆ ئەوەی خەیاڵ وهەست و کرداری خۆیان بگۆڕن. ئامانج ئەوەیە کەخەڵکی هان بدەن و وزەیان پێ ببەخشن و دەست بە کارێك بکەن کە ئەگەر قسەکانی ئێوە نەبوایە یان نەبیستایە، دەستیان بەو ئیشانە نەدەکرد. هەر قسەیەك کە دەیکەن دەبێت کاریگەری لەسەر بیسەران هەبێت و هەنگاوێکی گوڕانکاری بێت لە سەر ئەوان.

## بە گاڵتەوە دەست پێ بکەن:

ئێوە دەتوانن قسەکانی خۆتان بە گاڵتەوە دەست پێ بکەن. بەلام تەنها مەرجی ئەوەیە کە تەبیعەتەن سوعبەت چی بن و بتوانن زەردەخەنە بخەنە سەر لێوی بیسەران و ئامادەبوان. لەم ڕووەوە دەبێت قسەخۆشەکان و گاڵتەکانتان لە سەر چەند کەسێك تاقی بکەنەوە بۆ ئەوەی لە کاریگەری ئیشەکەتان دڵنیا بن.

هەندێك لە باشترین وتاردەران وتارەکانیان بە قسەی خۆش دەست پێ دەکەن. ئەم نوکتە یان ئەم قسەخۆشانە دەبێت بە شێوەیەك بێت کە کاریگەری لەسەر ئامادەبوانی کۆڕەکە هەبێت و سەرنجی ئەوان بۆ لای

خۆتـان ڕابکێشـێت. بـەڵام ئەمـەش هونەرێکـە. کەسـایەتی تایبـەت داوا دەکات تا کەسێك قسەی خۆش وسەرنج ڕاکێش بکات.

لێرەدا ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ دەکەم. دەست پێ کردنی وتار بە قسـەی خۆش یان نوکتە ئیشـێکی زۆر سـادەیە، سـەرەتا هەمیشـە وتارەکانم بـە قسـەی خـۆش و نوکتـە دەبـوو، دواتـر بـەم ئەنجامـە گەشـتم کـە کـاتێ وتارەکـەم بـە قسـەی پێکـەنیناوی و نوکتـەوە دەسـت پـێ دەکـەم، ئامادەبوانی کۆڕەکە گومـان لـەوە دەکـەن کـە لەوانەیـە هـەموو قسـەکانم پێکەنیناوی بێت. دواتر ئەگـەر بشـمەوێت بڕۆمـە سـەر بابـەتێکی گـرنگ و باسی بکەم ئەوا ئەوان ئەم بابەتەش هەر بە پێکەنیناوی سـەیر دەکـەن و بەگومانن لە ڕاستی ئەم بابەتە و دوودڵ دەبن.

دڵ خۆشکەر بن:

(بیـڵ گـو) یەکێکە لە باشترین وتاردەران، دوای ئەوەی بۆ وتاردان ناسرا بە شێوەیەك بـۆ سـەر شـانۆ (مەسرەح) دەڕوات. هـەروەك بڵێـی لەگـەڵ کەسـێك لـە تەنیشـت مەسـرەحکەدا قسـە دەکـات ئێسـتا هـاتووە تـا قسەکەی بۆ ئامادەبوانی کۆڕەکە بکـات. ئامـادەبوانی کۆڕەکـە لـە بـارەی بابەتە کاریگەرەکەی ئەو وابیر دەکەنەوە کە بابەتەکەی بێ هاوتاییە.

بیـڵ بۆ تەنیشت شانۆ (مەسرەح) دەڕوات و بەشێوەی چەپەکردن قسـە دەکات. دواتـر بـە دەسـتەکانی بـە ئامـادەبوانی کۆڕەکـە دەڵێـت کەبێنـە پێشـەوە و نزیـك بنـەوە لێـی. بـە کەسـێك دەڵێـت نزیـك بـەرەوە لـێم و دەمەوێت قسەت لەگەڵ بکەم، دواتریش دەسـت بـە قسـانێك دەکـات وەك ئەوەی بیەوێت کە ئەوان ڕازی بکات. بە ڕەفتارەکـانی هـەموو ئامـادەبوان دەخاتە پێکەنین.

## پرسیارێك بکەن، لێکۆلینەوەی لەسەر بکەن:

دەتوانن وتارەکەتان بە باشی دەست پێبکەن و پرسیار لە ئامادەبوانی کۆڕەکە بکەن. پێیان بڵێن هەرکەس کە دەیەوێت وەلآمی پرسیارەکە بداتەوە با دەستی بەرز بکاتەوە ئەو کاتەش من مۆڵەتی قسەکردنی پێ دەدەم، بۆ نمونە بڵێن: (( ئەمە سەردەمێکی باشە بۆ ئیش کردن چەند کەس لە ئێوە لەم سەردەمەدا ئیش دەکات؟ )) دواتر خۆتان دەستەکانتان بۆ سەرەوە بەرن بۆ ئەوەی ئامادەبوانی کۆڕەکە چاو لە ئێوە بکەن و ئەوانیش هەمان شت بکەن. من بۆ خۆم سودێکی زۆر باشم لەم ڕێگەیە بینیوە. دوای ئەوەی کە هەندێکیان دەستیان بەرز کردەوە، پرسیارێکی تر دەکەم: ((چەند کەس لە ئێوە ئیش بۆ خۆی دەکات؟ )) دواتر کەسێك لە ئامادەبوانی کۆڕەکە دەڵێت: (( ئێمە هەموومان ئیش بۆ خۆمان دەکەین!)) دواتر منیش دەڵێم: (( بەڵی وایە حەق بە ئێوەیە، ئێمە هەموومان ئیش بۆ خۆمان دەکەین. لەو ڕۆژەوەی کە دەست بە ئیشەکەمان دەکەین تا ئەو کاتەی کە توانای ئیش کردنمان نامێنێت وخانەنشین دەبین، بۆ خۆمان ئیش دەکەین. گرنگ نییە کە چی کەسێك پارە بە ئێمە دەدات گرنگ ئەوەیە کە ئێمە ئیش دەکەین.))

## کارێك بکەن کە ئامادەبوانی کۆڕەکە لەگەڵ یەکتردا قسەبکەن:

دەتوانن لە ئامادەبوانی کۆڕەکە داوا بکەن هەرکەسێك لەگەڵ ئەو کەسەی کە لە تەنیشتیدا دانیشتوە قسە بکات. بۆ نمونە دەتوانن بڵێن:(( بەو کەسەی کە لە تەنیشتاندا دانیشتوە بڵێن کە دەتانەوێت لەم کۆڕەدا فێری

چی ببن. )) ئەگەر قسەکەتان زانستی بێت. ئەوان وەلامی ئەم پرسیارەی ئێوە دەدەنەوە.

## وتارەکەتان بە بابەتێك دەست پێبکەن:

دەتوانن بابەتێك باس بکەن کە ئەوان تێبگەن. ئەگەر بابەتەکەی ئێوە بە شێوازێك بێت کە هەموو ئەوان لێی تێبگەن، ئەوکاتە سەرنجی ئامادەبوانی کۆڕەکە بۆ خۆتان ڕادەکێشن، بۆ نمونە دەتوانن بڵێن:

لە ٦٣٪ی ئەو کەسانەی کە لە ساڵی ١٩٤٠دا لە دایك بوون. ئێستا خانەنشین بوون و ئەمە لە کاتێکدایە کە هێشتا زۆربەی ئەوان پارەیەکی باشیان کۆ نەکردوەتەوە. دەبێت لەم بوارەدا هەنگاوی خێرا بەجێ بگەیەنن بۆ ئەوەی هەر کەسێك کە خانەنشین دەبێت بتوانێت ماوەی ئەو تەمەنەی کە ماویەتی بە خەیاڵێکی ئاسان بژیت.

## دەستەواژەیەك بڵێن و پرسیارێك بکەن:

دەتوانن قسەیەکی جدی بکەن و دواتر پرسیارێکیش بکەن. دوای جوابی پرسیارەکە بدەنەوە و پرسیارێکی تر دروست بکەن. ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئامادەبوانی کۆڕەکە سەرنجی بابەتەکە بدەن و بۆ یەك بەیەکی ووشەکانی ئێوە گوێ بگرن. سەرنجی ئەم نمونەیەی خوارەوە بدەن:

لە٢٠٪ی خەڵکی لە کۆمەڵگادا لە ٨٠٪ی دەسکەوتی کۆمەڵگا بەدەست دێنن. ئایا ئێوە لە ڕیزی ئەم لە٢٠٪ەن؟ ئەگەر نین، ئایا حەز دەکەن لە ڕیزی ئەم لە ٢٠٪ە یان لە ڕیزی ١٠٪ سەروتر بن؟ زۆر باشە، لە چەند خولەکی داهاتودا ئێوە بە بابەتێك دەناسێنم کە بتوانن بە ئەم

داواکارییەی خۆتان بکەن. ئایا ئەمە دەتوانێت ئامانجێکی گونجاو بێت بۆ کۆڕەکەی ئەمڕۆ؟ ئەمە ڕووداوێکی باشە کە کەسەکان لەماوەی منداڵیاندا فێری ئەوە دەبن کە کاتێك پرسیارێك لە ئەوان دەکرێت، وەڵامی پرسیارەکە بدەنەوە. کاتێك پرسیارێك دەکەن ئەوان وەڵامی پرسیارەکە دەدەنەوە تەنانەت ئەگەر وەڵامی پرسیارەکەش لە دڵیاندا بیدەنەوە.

کاتێك دەپرسن: (( چەند کەس لە ئێوە دەیەوێت لە چەند ساڵی داهاتوودا یان لە یەك یان دوو ساڵی داهاتودا دەسکەوتەکەی بۆ دووئەوەندە زیاد بکات؟ )) تەقریبەن بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە زۆربەی یان هەموو ئامادەبوان دەستیان بەرز دەکەنەوە.

هەرکاتێك پرسیار دەکەن و دواتر بۆ ماوەیەك بێدەنگ دەبن بۆ ئەوەی ئامادەبوان پرسیارەکە لێکبدەنەوە کونترۆڵی تەواوی ئامادەبوان بە دەست دێنن.

تەنانەت ئەگەر ئامادەبوانی کۆڕەکە وەڵامی پرسیارەکەش بەدەنگی بەرز نەدەنەوە. ئەوا ناتوانن وەڵامی پرسیارەکە بە خۆیان نەدەنەوە.

## بە چیرۆکێك دەست پێبکەن:

دەتوانن وتارەکانتان بە ڕووداو یان چیرۆکێك دەست پێبکەن. (( یەکێ هەبوو یەکێ نەبوو)) ئەم ڕستەیە باشترین مەبەستە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی بیسەران بۆ خۆتان.

کەسەکان لەماوەی منداڵیەوە تا ئێستا زۆر چیرۆك و ڕووداوی جیاوازییان بیستووە و لە بیریانە. وتارەکەتان بە (( یەکێ هەبوو، یەکێ نەبوو )) دەست پێ دەکەن، بە ئامادەبوانی کۆڕەکە دەڵێن چیرۆکێك هەیە. بیسەران دوای ئەوەی کە ئێوە ئەم قسە دەکەن بێدەنگ دەبن وەك

منداڵەکان سەیری پێشەوە دەکەن و چاوەڕوانی قسەی ئێوە دەکەن.
وەك ئەوەی لە تەنیشت ئاگرێکدا دانیشتبن و خۆیان گەرم بکەنەوە. من لە کۆڕەکانمدا، بەتایبەتی ئەگەر بڕیار بێت ڕۆژێکی تەواو بەردەوام بم یان ڕۆژێکی تەواو ببات. لە نێو قسەکانمدا دەڵێم: (( یەکێ هەبوو، یەکێ نەبوو، پیاوێك لە شارێکدا دەژیا کە. . . . . . . . . . ))
لە کاتی ئەوەدا کە ئەم ووشانە دەڵێم، بیسەران بە خێرای لە سەر کورسیەکانیان دادەنیشن و جێگیر دەبن. بۆ ئەوەی گوێ بۆ ئەو بەشەی تری چیرۆکەکە بگرن کە ماویەتی. ))

## پردێك دروست بکەن:

یەکێك لە گرنگترین بەشەکانی دەست پێ کردنی وتاردانێك ئەوەیە کە پردێك لە نێوان خۆتان و ئامادەبوانی کۆڕەکەدا دروست بکەن. بە بابەتێك دەست پێ بکەن کە ئێوەو ئامادەبوانیش لە سەر ئەو بابەتە هاودەنگ بن. وەك ئەوەی ئەمڕۆ لە کارەکەی ئەواندا یاخود لە پیشەکەی ئەواندا کار دەکەن یان لە ڕابردوودا کارتان کردووە. یان وەك ئەوەی ئێوە لەوانەیە منداڵتان هەبێت. بە هەمان شێوەش لەوانەیە ئەوانیش منداڵیان هەبێت یان لە ڕابردوودا ببنە خاوەنی منداڵ، یان لەوانەیە ئێوە شارەکەی ئەوان بناسن یان لایەنگری تیپی وەرزشی ئەو شارە بن.
کاتێك چەند خولەکێك بەهەدەر دەدەن بۆ ئەوەی ئەم پردە لە نێوان خۆتان و ئەواندا دروست بکەن. ئەوان بخەنە سەر بیرۆکەکەی خۆتان. لەم بارودۆخەدا ئەوان بە ئاسانی چاوپۆشی هەڵەکانی ئێوە دەکەن. وا هەست دەکەن کە ئێوە زانست زانیاری زۆرتان پێیە بە ئاسانی دەتوانن لەگەڵ ئێوەدا بژین.

## له بارەی خۆتانەوە لەگەڵ ئەواندا قسە بکەن:

کاتێك کە لەگەڵ کۆمەڵێ لە بەڕێوبەران، فرۆشیاران و کارمەندانـدا قسـە دەکەم، بە ئەوان دەڵێم: (( مـن بـەبێ ئـەوەی لـە ئامادەییـدا دەربچـیم، دەستم بە کارەکەم کرد.ماڵـەوەمان پـارەی پێویستیان نـەبوو. مـن هـەر سەرکەوتنێك و هەر هەنگاوێکی باشم لە ژیانمـدا بـە دەسـت هێنابێـت، بـە چالاکی و ماندوو بونی خۆم بە دەست هێناوە. ))

ژمارەیـەکی زۆری ئـەو کەسانەی کـە قسـەکانی منیـان بیسـت لـە کۆتـای وتاردانەکەمدا بۆ لای من دێن و پێم دەڵێن کە ژیانی ئـەوانیش هاوشـێوەی ژیانی من بووە. پشتگیری قسەکانم دەکـەن. کاتێـك ئـەم قسـانە دەکـەم، ئەوان بە خۆشەویسـتی و دڵ گەرمیـەوە گـوێ بـۆ قسـەکانی مـن دەگرن. دروستکردنی پـردێ لـەم شـێوەیە بـۆ هانـدان و ڕاکێشـانی ئـەوان بـۆ لای خۆتان کاریگەریەکی زۆر و دەورێکی سەرەکی هەیە.

## پـوخـتـە:

توانای دەست پێ کردنێکی بەهێز بۆ ئامادەبوانی کۆڕەکە هەوڵێکی زۆری دەوێت بۆ ئەوەی فێر ببن کە چۆن دەست بە وتـاردانێکی بـە هێـز بکـەن. لـەوەی بـزانن کـە چـۆن دەناسـرێن. چـۆن بێنـە سـەر شـانۆ (مەصـرەح) وتارەکە دەست پێ بکـەن یـان باسـی بکـەن. ڕۆڵـی سـەرەکی کاریگـەری دەبێت. توانای دەست پێ کردنـی وتـاردان بـە شـێوەیەکی گـەرم و گـوڕ، هاوڕێیان، بارودۆخێك دروست دەکات بۆ ئەوەی بتوانن وتارە داواکراوەکـە بە شێوەیەکی باش و کاریگەر پێشکەش بکەن.

بەشی پێنجەم



# زاڵ بوون بەسەر كۆڕ و كۆمەڵە بچوكەكاندا

مرۆڤی كاریگەر، هەمیشە لە دەست پێ كردنی كۆڕەكەیدا بە ئامانج و ئەنجامێك كە دەیەوێت بگات ئاماژە دەكات. ئەو هەمیشە لە كۆتای كۆڕەكان بە دەستەواژەی سەرەتای خۆی لە وتاردانەكەیدا دەگەڕێتەوە ئەنجامی دەسكەوتوی لەگەڵ نیازی سەرەكی خۆیدا بەراورد دەكات.

" پیتر دروكر"

توانی ئێوە لە باش وتارداندا و ڕازی كردنی كەسەكان لە كۆڕە بچووكەكاندا دەتوانێت كاریگەریەكی باشی لە سەر ناوبانگ و ژیانتان دابنێت. لە ئیشی بازرگانی خەڵكانی تردا هەمیشە ئێوە هەڵدەسەنگێنن بە ئاگادار بوون لە خۆتان یان بێ ئاگایانە بیر و بۆچوونی خۆیان لە بارەی كەسایەتی، توانای لێهاتوی یەك باوەڕی و دڵنیاییان سەبارەت بە ئێوە دیاری دەكەن. لە بەر ئەم هۆكارە دەبێت لە كۆڕە بازرگانیەكاندا ڕووداوی گرنگ لە ئیش و ناوبانگی خۆتان لێكبدەنەوە. نابێت بهێڵن كۆڕەكانی ئێوە بە دوو یان چەند كەس بەبێ پلانی پێشو بە شێوەیەكی هەڵكەوتانە بەڕێوە بچێت. ئاگاداربن یان بزانن ٥٠٪ی كاتەكان یان ڕۆژەكانی بەڕێوبەران لە كۆمپانیاو كۆڕەكاندا بە سەر دەبەن وە هەروەها

ئەم رایەیش بوونی هەیە کە لە ٥٠٪ی کاتی کۆڕەکانیش بە هەدەر دەدرێت.

پیتەر دروکر دەنوسێت: (( کۆر هۆکارێکی گرنگی بەڕێوبردنە )) بەڕێوبەر کەسێکە کە ئەرکی بەڕێوبردنی ئیشێك یان کۆمپانیایەك یان دەزگایەکی حوکمی ...... هتد پێ سپێردراوە هەر بەو شێوەیە کەباسمان کرد هەر کەسێك لە بەرامبەر کارەکەیدا بەڕێوبەرە. کەواتە ئێوەش لەم یاسایە بەدەر نین.

## کۆڕە بچوکەکان گرنگن:

زۆربەی قسەکانی ئێوە لە زۆربەی کاتدا لەگەڵ کۆڕە بچووکەکاندایە وهەندێ کات ژمارەی ئەو کەسانە کە لەگەڵ ئێوەدا لە کۆڕەکەدا ئامادەن لە یەك یان دوو نەفەر تێ پەڕناکات. ئەم کۆڕانەش لە رووی پلان دانانەوە هیچی جیاوازیکیان نیەو دەبێت بە شێوەیەکی ورد پلانی بۆ دابنرێت. ئەوەی کە ئێوە لەم کۆڕەدا چۆن دەردەکەون. پەیوەندی بە خۆ ئامادەکردن و ڕاهێنانی ئێوە وە هەیە بۆیە ئەگەر بتانەوێت بەو شێوەیەی کە خۆتان دەتانەوێت دەربکەون. دەبێت هەوڵێکی زۆر بدەن.

چەند ساڵ لەمەوپێش بۆ کۆمپانیایەکی گەورە لە بواری پلاندانانی ستراتیژی ئیشم دەکرد. بەڕێوبەران و کەسە پلە بەرزەکانی کۆمپانیا لە شوێنە دوورەکانی ولاتەوە بۆ ئەم کۆمپانیایە هاتبون. زۆربەی بەڕێوبەران و کەسە پلەوپایە بەرزەکانی کۆمپانیا کە لەوێدا کاریان دەکرد، گرنگیان بەوە نەدەدا کە کۆڕەکە بە چی ڕێگەیەکدا دەڕوات و بە کوێ دەگات. بەلاّم دوو کەس لە بەڕێوبەرە پلەوپایە بەرزەکان کە لە بەشە دوورەکانی

کۆمپانیا ئیشیان دەکرد. هەوڵێکی زۆریان دابو و خۆیان ئامادە کردبوو وە ڕۆڵێکی سەرەکیان لە کۆڕەکەدا بینی.

لە یەکێك لە ڕێستەکاندا لەگەڵ سەرۆکی کۆڕەکەدا لە بارەی پێشکەوتنی کۆڕەکە قسەم کرد. ئەو لە درێژەی قسەکانماندا بە منی گوت: (( ئایا تۆ ئاگادار بووی ئەو دوو بەڕێوبەرە چالاکە چەند ئامادەیەکی باشیان هەبوو؟ )) بۆ هەمووان ئاشکرا بوو کە ئەو دووبەڕێوبەر ئامادەیەکی زۆر باشیان هەبوو. من لێرەدا لە قسەی سەرۆکی کۆمپانیاکە تێگەشتم. کە ئەویش کەوتوەتە ژێر کاریگەری ئەوانەوە. بۆ ماوە یەك مانگ دواتر، لە ڕۆژنامەیەکدا لە بەشی بازرگانی ناوخۆیدا ئاگادارییەك چاپکرابوو کە ئەمەی ئاشکرا دەکرد ئەم دوو بەڕێوبەرە بەرەو پێش چوو بوون پلەو پایەیان پەیا کردبوو تا ئەو ڕادەیەی کە گەشتبونە جێگری سەرۆکی کۆمپانیا، چەند ساڵ دواتر یەکێك لەو دوو بەڕێوبەرە چالاکە لە لایەن کۆمپانیایەکی یەك ملیارد دۆلاری هەڵبژێردرا. چەند مانگێك دواتر لە هەمان کۆمپانیادا چەند بەڕێوبەرێکی خانەنشین کرد کە لەو کۆڕەدا گوێیان بە وتاردان نەدا.

## خۆتان بە باشی ئامادە بکەن:

خاڵی دەست پێ کردنی سەرکەوتن لە کۆڕەکاندا بە پێکهێنان و ئامادە کردنی خۆتان دەست پێ دەکات. هەموو ئەو کەسانەی کە لە کۆڕەکاندا بەشدار دەبن لە ئامادەبون یان ئامادە نەبونی کەسانی تر ئاگادار دەبن. ئەگەر بڕیار بێت کۆڕەکە بەڕێوەبەرن، خۆتان بۆ بەڕێوە بردنی کۆڕەکە ئامادە بکەن.

یاسای کۆڕەکە پێکبهێنن. ئەو کەسانە کە دەتانەوێت میوانداریان بکەن هەڵیان بژێرن. زانیاری بە ئەوان بدەن کە چی چاوەڕوانییەکتان لەوان هەیە.

ئەگەر بڕیار بێت یەکێك بن لە بەشداربوانی کۆرەکە، پلان بۆ بەشداربونتان دابنێن. زانیاریتان لە بارەی کۆڕەکەوە هەبێت، ئەو بزانن کە بڕیارە لە بارەی چی بابەتێکەوە قسە بکرێت. سەرنجی ئەم خاڵە بدەن کەسانێك کە لە کۆڕەکەدا قسە ناکەن. بە بۆچوونی خەڵکانی تر هیچی قسەیەکیان بۆ وتن پێ نییە.

## گرنگی بەوە بدەن کە لە کوێدا دادەنیشن:

چەند خولەکێك پێش ئەوەی کۆڕەکە دەست پێ بکات بۆ هۆڵ یان شوێنی کۆڕەکە بڕۆن بۆ ئەوەی جێی دانیشتنی خۆتان بە وردی دیاری بکەن. ئەگەر ئێوە بەڕێوبەری کۆڕەکەن، بە شێوازێك بوەستن یان دابنیشن کە پشتتان لە دیوارەوە بێت. لە بەرامبەر دەرگای هاتنە ژوورەوەدا بن بۆ ئەوەی بتوانن شوێنەکە بەباشی بەڕێوەبەرن. دەبێت لە شوێنێکدا بن کە بە ڕوونی بتوانن هاتووچۆی هەموو بەشداربوان ببینن.

ئەگەر بڕیار بێت بەرپرسی بەڕێوبردنی کۆڕەکە بم، شوێنی هەموو بەشداربوان دیاری دەکەم. بەم شێوەیە دەتوانم کەسایەتیە گەورەکان و ناودارەکان لە باشترین شوینی هۆڵەکەدا دابنیشێنم.

ئەگەر ئێوە بەڕێوبەری کۆڕەکە نین بەڵکو بەشداربویەکی کۆڕەکەن، یا بەرانبەر دەرگاکە دابنیشن یا لە سوچیەکانی کۆڕەکەدا یا لە بەرامبەر کەسە بەڕێوبەرەکەدا دابنیشن. کەواتە هەوڵبدەن لە شوێنێکدا دابنیشن

كه به سەر كۆڕەكەدا زاڵ بن و به جوانی بتوانن ببینن و به ڕوونی بتوانن ببیستن.

## ئاگاداری كات بن:

لە كاتی خۆیدا دەست پێ بكەن، ئەگەر كەسێك هێشتا نەهاتووە، چاوەڕێی ئەو مەكەن چونكە لە كاتە دیاری كراوەكەی ئێوە كەم دەبێتەوە. گریمان بۆ نەهاتنی ئەو دابنێن و وتارەكەتان دەست پێ بكەن. سوپاسگوزاری ئامادەبوانی كۆڕەكە بن بە هۆی بەشداری كردن و هاتنیانەوە، هۆكاری ڕێكخستنی كۆڕەكە بڵێن. لە بارەی پێكهێنانی كۆڕەكەوە قسە بكەن. كاتژمێرو تەنانەت خولەكی كۆتای هێنان بە كۆڕەكە ئاشكرا بكەن و بە ئامادەبوانی كۆڕەكە بڵێن. بۆ ئەوەی بەشداربوانی كۆڕەكە بزانن كە لە چی كاتێكدا كۆڕەكە تەواو دەبێت.

## جۆری كۆڕەكان:

دەتوانین كۆڕە بازرگانیەگان بۆ چوار بەش دابەش بكەین:

چارەسەری بابەت. ئامانجی كۆڕەكە باس كردنە لە بارەی بابەتێك و پەیدا كردنی ڕێگە چیارەی.

زانیاری پێدان. ئامانجی كۆڕەكە ئەوەیە كە زانیارییەكان بۆ بەشداربوانی كۆڕەكە باس بكەن.

ئاشكرا كردنی بەرهەمی نوێ. ئامانجی پێكهێنانی كۆڕەكە ئەوەیە كە كاڵای بەرهەمهێنراوی نوێی خۆتان بە ئامادەبوانی خۆتان بناسێنن. سەرنج بدەن بزانن كە هەموو بەشداربوانی كۆڕەكە بە باشی لەگەڵ ئەم بەرهەمە نوێیەدا ناسێنراون.

*کۆمەڵە دروست کردن. ئامانجی پێکهێنانی کۆڕەکە ئەوەیە کە بەشداربوان لە کارەکانیان پێشکەوتنەکانیان ئاگاداربن.

## سەرۆکی کۆڕەکە:

ئەگەر ئێوە کۆڕەکە بەڕێوە دەبەن، دەبێت وەرەقەو کورتە باس لە بارەی وتارەکەوە لە نێو بەشداربواندا دابەش بکەن. ئەگەر لە پاورەپۆینت بۆ نیشاندان سود وەردەگرن، دەبێت لە پێش کۆڕەکەدا لە خراپ نەبونی دڵنیا بن و بەباشی ئامادەی بکەن. لەبارەی کارو پێ کردنیەوە زانیاری تەواوتان هەبێت.

کۆڕەکەتان بە گرنگترین زانیاری دەست پێ بکەن. ئامانج ئەوەیە کە ئەگەر لە ژێر گاریگەری پرسیارانێکی زۆری ئامادەبوانی کۆڕەکە نەتوانن هەموو بابەتەکە باس بکەن. بە لایەنی کەمەوە ٢٠٪ی بابەتەکە لە خۆ دەگرێت. دەبێت یان مەرجە کە لە ٨٠٪ی بابەتەکەتان باس کردبێت.

## بەشداربووانی چالاك:

ئەگەر یەکێك لە بەشداربوانی کۆڕەکەن، پرسیار بکەن، قسەیەك بکەن و یالە ٥ خولەکی سەرەتای کۆڕەکە بابەتەکەی خۆتان ڕوون بکەنەوە. کەسانێك کە لە ٥ خولەکی سەرەتای کۆڕەکە قسە دەکەن، کاتی گونجاوی بۆ دەمێنێتەوە لەو کاتەی کە لە کۆڕەکەدا ماویەتیەوە.

## بۆ قەبوڵکردنی بەر پرسیارەتی خۆتان هەڵبژێرن:

ڕێگەیەك بۆ گۆڕان بە بەشداربویەکی چالاك و زیرەك ئەوەیە کە پێشنیار بکەن ئیشێك کە بونی هەیە جێ بەجێی بکەن. لە هەر ڕێکخراو گروپێکدا

لە۲۰٪ی کرێکاران لە ۸۰٪ی کارەکەیان ئەنجام دەدەن. ئەو بەشداربوانەی کە بە شوێن کاردان. لەلای هەموو کەسێك داوا دەکەن.
کاتێك لە بارەی بابەتێکەوە قسە دەکرێت، لەخۆتان بپرسن کە چی کارێك پەیوەندی بەوەوە هەیە کە دەتوانن ئەنجامی بدەن. لە بەڕێوبەرانی کۆڕەکە بپرسن: ((چی پلانێك بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم پلانە هەیە؟ دوای ئەمە دەبێت چی بکەین؟ )) دەستتان بەرز بکەنەوە بۆ ئەم بەرپرسیاریەتیە خۆتان هەڵبژێرن.

## لە پێشدا ئامادەبن:

کاتێك چاوەڕوانی ئێوە دەکرێت کە زانیارییەکان لە کۆڕەکەدا باس بکەن، لە پێشدا ئامادەکاری یان پێکهێنانێکی باش بکەن. سەرەتا بیروبۆچوونەکانی خۆتان باس بکەن، هۆکاری ئەم بۆچوونانەتان ڕوون بکەنەوە. ڕوونی بکەنەوە کە بۆچی هۆکارەکانی ئێوە ڕاستن ودواتر بۆچوونەکانی خۆتان کۆ بکەنەوە.
ئەمە ڕێگەیەکی گونجاوە بۆ کارکردنە سەر کەسان بەم ڕێگەیە دەتوانن بەشداربوانی کۆڕەکە بخەنە ژێر کاریگەری خۆتانەوە.

## ڕازی کردنی خەڵکانی تر:

کلیلی سەرکەوتن لە کۆڕێکدا ئەوەیە کە بتوانن خەلکی ڕازی بکەن لە وتارەکەتان. بەم شێوەیە دەتوانن قسەکانتان بکەن ولەسەر بڕیاردانی کۆتای کاریگەریتان هەبێت.
بۆ ئەوەی لە کۆڕێکدا تایبەت دەرکەون، دەبێت بەشداربوانی کۆڕەکە ئێوەیان خۆش بوێت. بۆ ئەوەی ئێوەیان خۆشبوێت. دەبێت خۆشەویست

بن. دەبێت بیانەوێت و حەز بکەن کە پشتیوانی ئێوە بکەن باوڕو بیروبۆچوونەکانی ئێوە قەبوڵ بکەن. ڕێگەی زۆر کردنی دەسەڵاتی خۆتان و ڕازی کردنی خەڵکی زۆر سادەیە: وا لە خەڵکی بکەن کە هەست بە گرنگی خۆیان بکەن.

بۆ ئەوەی هەستی گرنگ بوون بە خەڵکی بدەن، دەبێت سەرنجی شەش بابەت بدەن. بۆ بردنەوە لەوتارداندا دەبێت سەرنجی ئەم شەش بابەتە گرنگە بدەن.

١) قەبوڵ کردن: یەکێك لە گەورەترین ئاواتەکانی مرۆڤ ئەوەیە کە دەیەوێت خەڵکی بەبێ بەند و مەرج و بەبێ چۆن و بۆچی ئەو قەبوڵ بکەن. بۆ ئەوەی نیشان بدەن کە کەسێك قەبوڵ دەکەن، لە کاتی هاتنە ژوورەوەدا ولە کاتی قسەکردنیدا، سەیرێکی ئەو بکەن وپێکەنینێکی پێشکەش بکەن. ئەم هەنگاوەی ئێوە باوڕبەخۆبونی ئەو زیاد دەکات ئەو دەیەوێت بە هەرشێوەیەك بێت پشتگیری قسەکانی ئێوە بکات.

٢) سوپاس و ڕێز لێنان: هەرکاتێك سوپاسی کەسێك دەکەن و ڕێزی لێ دەگرن، باوڕبوونی ئەو زیاد دەکات وبە هۆی ئەو ڕێزەوە کە ئێوە لێی دەگرن خۆش ویستنی خۆی زیاد دەکات. ئاسانترین کار بۆ گەشتن بە ئاوا سوپاس کردنێکی گرنگ ئاسای ترە لەوکارە کە لایەنی بەرامبەر ئەنجامی داوە. هەرکاتێك سوپاسی کەسێك دەکەن بەهۆی ئەو کارەی کە کردوویەتی، هانی ئەو دەدەن کە ڕەفتار پێشوی دووبارە بکاتەوە.

٣) پەسەندکردن: هەموان حەز دەکەن لەلایەن بەرامبەریانەوە پەسەند بکرێن و باس بکرێن. کاتێك سوپاسی کەسێك دەکەن بە هۆی ئەو قسەی کە کردوویانە یان ئەو ئیشەی جێ بەجێیان کردووە. هەست بە ڕێزیان

بەهایەکی زیاتری خۆیان دەکەن. هەست دەکەن کە مرۆڤێکی بە نرخن لە ئەنجامیشدا خۆشەویستیان بۆ ئێوە زیاتر و زیاتر دەبێت.

٤) پشتگیری: بە دڵنیایەوە ئێوەش ئەم رستەتان بیستوە:(( بچووکەکان بۆی دەگرین، گەورەکانیش بۆی دەمرن. )) هەموان پێویستمان بە پشتگیری یەکترییە، بە تایبەتی کەسانێك کەرێزیان لێ دەگرین. هەرکاتێك باسی کەسێك دەکەن و پشتگیری پیشەکەی دەکەن وکارەکەی پەسەند دەکەن، باوڕبەخۆبوون و بیرکردنەوەی ئەو باشتر دەکەن. هۆکار دەبن بۆ ئەوەی لەبارەی خۆی ولەبارەی ئێوەش هەستی باشتر پەیدا بکات. باشترە لە کاتی پشتگیری هەر کەسێك زۆر بڵێی نەکەن. لەبری ئەو بڵێن: (( کارەکەت زۆر باش بوو. )) بڵێن: (( ئەو بابەتەی کە هەڵتان بژاردبو و باستان کرد زۆر کاریگەر وسەرنج راکێش بوو. ))

٥) سەرنج: کەسەکان هەمیشە سەرنجی کەسانێك و شتانێك دەدەن کە لەلای ئەوان گرنگن یان بە نرخن. هەرکاتێك سەرنجی هەر کارێکی تایبەتی بدەن، ئەو هەست بەنرخ بوون و گرنگ بوونی خۆی دەکات. رێگەی سەرنج دان، گوێ گرتنێکی وردە بۆ کەسێك کە قسە دەکات. کەسێك کەسەرنجی کەسێك دەدات، هەرگیز قسەکانی ئەو نابڕێت. لە کاتێکدا کەکەسێك قسە دەکات پێویستە ئێوە سەیری ئەوان بکەن و لە ووشەکانیان ورد بنەوە و بەباشی گوێ بۆ قسەکانیان بگرن، سەرتان بۆ پشتگیری کردنی قسەکانی بجوڵێنن، زەردەخەنەیەك بکەن و وادای بنێن ئەو قسەیەی کە دەیکات زۆر گرنگە.

٦) هاودەنگی: کارێکی تر کە دەبێت لە کۆڕەکاندا بیکەن ئەوەیە کە لەگەڵ بەشداربواندا دەبێت هاودەنگ بن و بۆچوونی سەرکەوتوتان

هەبێت، بەبێ هۆ و لەخۆوە لە ئەوان نارازی مەبن یان بەرهەڵستیان مەکەن. بڵێن: (( خاڵکی گرنگم بەبیردا دێت، کە پێشتر بیرم لەم بابەتەیە نەکردبویەوە. ))

لە بری ئەوەی بڵێن:(( من بەرهەڵستی قسەکەی تۆ دەکەم یان من هاودەنگ نیم لەگەڵ قسەکەی تۆدا و مخالفی قسەکەی تۆم. ))

دەتوانن بڵێن: (( خاڵێکی سەرنج ڕاکێشە، بەلاَم ئەگەر کەسێ لەم پەیوەندیەدا بەرهەڵستیت بکات چی وەلاَمێکی ئەو کەسە دەدەیتەوە؟ ))

## ڕەخنە مەگرن و بە نهێنی قسە مەکەن:

ئەگەر کۆڕێك بەڕێوە دەبەن، هێزێکی زۆرتان هەیە. هەموان دەیانەوێت بە شێوەیەك پەیوەندییان لەگەڵ ئێوەدا هەبێت کەلە پشتیوانی و بەرهەڵستی ئێوەدا قسە بکەن. کاتێك خەڵکی بۆ پشتیوانی ئێوە قسە دەکەن، دەبێت زەردەخەنەیەك بکەن وسەرتان بە شێوەی ڕەزامەندی بجوڵێنن و لە پلەوپایەی ئەوان پارێزگاری بکەن و قسە بکەن.

تەنانەت بڕۆ بەرز کردنەوەش، سەیرکردنێکی توند یان تورە لەلایەن وتاردەر بۆ ئەو کەسەی کە ڕەخنەکەی گرتوە، دەبێتە جێی سەرنجی هەموان. ئەم کردارەی وتاردەر دەبێتە هۆی ئەوەی کە لایەنی بەرامبەر هەست بە نا ئارامی بکات. ئێوە دەبێ ئەو کاتە دیاریکراوەی کە پێتان دراوە سودی لێ وەرگرن بەوەی کە ئارامی ئامادەبوانی کۆڕەکە بپارێزن. ئەگەر حەزتان لە قسە یان بۆچوونی یەکێك لە ئامادەبوان نەبوو، هێمن بن ئارامی خۆتان تێك مەدەن و لە بەرامبەر بەشداربواندا نارەزای پیشان مەدەن.

## لە کۆسپەکانی سەر ڕێگاتان پەیوەندی خۆتان بپارێزن:

کاتێك لە بەرامبەر کەسێکدا دادەنیشن، کەل وپەلەکان لە سەر مێزو جێگاکانی تردا دەبێتە هۆی کۆسپێك لەسەر ڕێگەی ئێوەو ئەوان یان کۆسپێك دروست دەکات لەسەر ڕێگەی هەردووکتان بەم شێوەیە هەردوو کتان هەست بە جیاوازی دەکەن. بۆ ڕزگار بوون لەم بارودۆخە، دەتوانن لە تەنیشت ئەودا دابنیشن. بەم جۆرە پەیوەندی دروستکردن لەگەڵ ئەودا زۆر ئاسان دەبێت.

## پوختە:

نیشانەی ناودار بون لە هەر کارێکدا پێکهێنان و ئامادەبونی پێشترە. هەرچی زیاتر خۆتان بۆ کۆڕەکە ئامادە بکەن، تەنانەت ئەگەر لەم کۆڕەدا تەنانەت یەك نەفەر سەر بە ئێوە ئامادە بێت بە سودتر وکاریگەرتر دێنە پێش چاو وئەنجامی باشتر بە دەست دێنن.

هێز هەمیشە لەگەڵ کەسێکدایە کە پێکهێنانی زیاتری بینیوەو بە ئاستی ئامادەییەکی باش گەشتوە. کاری ئێوە دەبێت ئەوە بێت کە لە هەر چاوپێکەوتن و گفتوگۆیەکدا سەرکەوتوو بن. دەبێت لە هەر گفتوگۆ و چاوپێکەوتنێکدا ڕۆڵی ئەکتەرێکی سەرەکی ببینن. ئامانجی ئێوە دەبێت ئەوە بێت کە خەڵکی ڕازی بکەن و کاریگەریتان لە سەریان هەبێت. بۆ گەشتن بەم ئامانجە. دەبێت لەو ڕێگایانە سود وەربگرن کە بە خەڵکی هەستی بە نرخ بوون وگرنگ بوون دەدات.

بەشی شەشەم



# لێهاتووی لە وتاردانداو گفتوگۆ لەگەڵ کۆمەڵە بچوکەکاندا

دابەشکردنی دەرامەتەکەتان لەگەڵ خەڵکیدا، گەورەترین چیاکە نیە کە دەتوانن لە بەرامبەر ئەواندا ئەنجامی بدەن. بەڵکو دەبێت دارایەکەی خۆی پێ نیشان بدەن.

" بنجامین دیزرائیلی"

ناوبانگ ودەرەجە لە کاتێکدا بە دەست دێت کە قسە بۆ کۆڕە بچووکە بازرگانیەکان دەکەن. بە هەمان شێوەی کە لە بەشی پێنجەم دا گوتم، زانینی چۆنیەتی سەرۆکی و بەشداریەکی کاریگەر لەکۆڕەکاندا گرنگ دەبێت. زۆربەیان لەم کۆڕانەدا لە ئێوەیان دەوێت بۆ ئەوەی ڕوانگەو بەرهەم، یان ڕێبازی خۆتان بەشێوەیەك باس بکەن کە خەڵکی ڕازی بکەن لەگەڵ ئێوەدا بن و پشتیوانی ئێوە بکەن.

کەواتە ئەگەر کۆڕە بازرگانیەکان دەرکەوتنی گرنگی بۆ بەڕێوبەرەکان هەبێت چۆنیەتی باس چۆنیەتی باس کردن لە کۆڕەکاندا گرنگ دەبێت.

چۆنیەتی باس کردن لە کۆمەڵە بچووکەکاندا دەتوانێت ببێتە هۆی سەرکەوتن یان سەرنەکەوتن لە پیشەکەتاندا:

هەر كاتێك كە بڕیارە بۆ كۆمەڵەیەكی بچووك وتار بدەن، وا دابنێن كە داهاتوی پیشەكەی ئێوە نادیارە و نەزانراوە. وا دابنێن كە بڕیارە ئەم كۆڕە لە سەر شریت تۆمار بكرێت و نیشانی هەزاران كەس بدرێت. وا هەست بكەن كە كامێرە شاراوەكانی كۆڕەكەیان خستوەتە كاروو وتارەكەی ئێوە تۆمار دەكات و لە كاتی گواستنەوەی وتارەكەی ئێوەیە بۆ تەواوی خەڵكی وڵات.

بە واتایەكی تر وتارەكەتان بەرەسمی وەربگرن. هەرچی وتاردانەكەتان جدی وجدی تر بگرن. ئامادەبوانی كۆڕەكە بەجدی ترەوە وەڵامە ئێوە دەدەنەوە. ئامادەبوان لە هەر كۆڕێكدا بەهەر ڕادەیەك، كلیلی سەركەوتن بە دەست دێنن. دامەزرێنەر لە ٩٠٪ لە ئەنجامی سەركەوتن یان سەرنەكەوتنی ئێوە تێ دەگات. بە وتەی یەكێ لە بریكارە بە ئەزمونەكان:(( بە بۆچوونی من هیچی ووشەیەك یان ڕستەیەك هێندەی ئامادەیەكی زۆر باشی پێش وەخت گرنگ نییە. ))

**بەوێنەگرتنی كۆتای كارەكە لە مێشكی خۆتاندا دەست پێ بكەن:**

ئامانجی وتاردانی خۆتان دیاری بكەن. ئامانج گیرانە بیربكەنەوە و لە خۆتان بپرسن: (( ئەگەر ئەم كۆڕە بە باشی پێشكەش بكریت چی ئەنجامێكی دەبێت؟ ))

بیروبۆچونەكانی خۆتان لە سەر وەرەقەیەك بنوسن، بنوسن ئەگەر وتاردانێكی زۆر باش پێشكەش بكەن هەموو ئەو ئەنجامانەی كە لە مێشكتاندایە بەدەستی دێنن. باشترین ئەنجامێك كە بە دەستان دەهێنا چی ئەنجامێك دەبێت. هەرچی باشتر هەوڵ بدەن و خۆتان ئامادە بكەن. ئەگەری بەدەست هێنانی ئامانجەكانتان زیاتر دەبێت.

## لە بیرتان بێت کە هەر کارێك جۆرێکە لە گفتوگۆ:

کاتێك بۆ کۆمەڵەیەکی بچووك وتاردەدەن و بۆ ئەوەی ئەوان ڕازی بکەن، لە ڕاستیدا لە کاتی ئەنجامدانی جۆرێك لە وتو وێژن. هەر تاکێك ی سەلیقەو بیروبۆچوونی تایبەتی خۆیەوە دێتە ناو هۆڵی وتاردانەکە. ئامانجی ئێوە نزێك کردنەوەی بۆچیونەکانی ئەوانە بە بۆچیونەکانی خۆتان و بەدەست هێنانی پشتگیری ئەوانە. بەم شێوەیە دەبێت بۆچوونی ئەوان لە هەندێك بواردا بە تەواوی بگۆڕن.

## وەك وەکیلێك بیر بکەنەوە:

بە مەبەستی ئامادەبون بۆ وتاردانێك، لە (( ڕێگەی بریکار ))سود وەربگرن. بریکارەکان فێر بوون کە بابەتی پەیوەندیدار بە لایەنی بەرامبەر زیاتر لە بابەتی پەیوەندیداری پەیوەست بە خۆیانەوە ئامادە بکەن. بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم کارە دەبێت تەواوی داواکاریەکان و بیرۆکەکانی لایەنی بەرامبەر لەگەڵ ئەوەی کە لەمێشکی ئێوەدا جیاوازییان هەیە لە سەر وەرەقەیەك بیان نوسن. ئەگەر دەتوانن وردترین جیاوازیەکان و ناڕەزایەکانی خۆتان کە پەیوەندی بەو کۆمەڵەوە هەیە کە لەگەڵیاندا قسە دەکەن پەیوەست بکەن.

## جیاوازی لە نێوان ترس و ویستندا بکەن:

من ساڵی یەك دوو جار لەگەڵ یەکێك لە بەڕێوبەرانی کۆمپانیا گەورەکان وتوویژ دەکەم. پێش دەست پێ کردنی کۆڕەکە لەگەڵ ئەواندا، تەواوی ئەو بابەت و هۆکارانەی کە بووەتە دوودڵی بۆ ئەوان و جێی گرنگی پێدانە دەینوسم. زۆربەی کات دەزانم کە ئەوان بەرگەی گۆڕان دەگرن. ئەم

بابەتە لە کاتی باس کردنیدا جێگەی گرنگی پێدانە. زۆربەی کات ئەم کۆمەڵە بە دوای شوێنێکی ئاسایش یان ئارامدا دەگەڕێن و لە بەرامبەر هەر بۆچوون و پێشنیارێکدا کە ئەوان لەم جێگەیە دوور بکاتەوە بەرهەڵستی دەکەن یان دژی دەوەستنەوە.

دووهۆکاری سەرەتای بۆ کڕین ـ یا تەقریبەن تەواوی بڕیارەکان کە پەیوەندییان بە گۆڕانکاری ـ ترس و ویستن دەبێت. لە دەستدانی کات، پارە، بایەخ، کەڵك یان هەرشتێکی تر کە خەڵکی دەخاتە ترسەوە. خەڵکی خەڵکی داواکاری کات و پارەو هەل و هیترن.

## لە قسەکەر تێ بگەن:

لە کاتی قسەکردن بۆ کۆمەڵێك لە خەڵکی. زۆربەی کات بە تەواوەتی لەگەڵ کەسانێکی جیاوازدا ڕووبەڕوو دەبنەوە. بەم واتایە کە هەر تاکێك ترسی جیاوازی هەیە. هەرچی زانیاریەکانی ئێوە لە بارەی ئەزمونەکان و ترسەکانی ئەوانەوە زۆرتر بێت، ئاسانتر دەتوانن توانا ئاشکراکانی خۆتان بە گونجاوی لەگەڵ ئەواندا باس بکەن و سەرنجیان ڕابکێشن.

من دەزانم بەڕێوبەرانی هەمان کۆمپانیا کە پێشتر لە بارەیانەوە قسەم کرد، لە بەرامبەر گۆڕانکارییەکاندا خۆڕاگر دەبن. لە کاتێکدا حەزێکی زۆریان لە فرۆشتن و قازانجی خۆیان هەیە، من هەمیشە بۆ زۆرتر فرۆشتن وقازانجی زۆر هەوڵ دەدەم، دوای ئەوە بۆ کەم بونەوەی ترس لە زیان، پێشنیار دەکەم بە کەمترین تێ چووون و یان بەبێ تێ چووون تاقی بکرێتەوە بۆ ئەوەی بزانم ئێمە بە قازانجی زۆر دەبات یان نا.

## تێ گەشتن لە ترسە ئاساییەکان:

زۆربەی خەڵکی لەوە دەترسن کە خەڵك بە خراپی کەڵکیان لێ وەربگرێت یان ببنە ئامرازێکی دەستی بۆ خراپ بەکارهێنانیان. ئەوان لەوە دەترسن کە مەجبور بە کارێك بکرێن لەگەڵ حەزی ئەواندا جیاواز بێت دەترسن لەوەی کەل و پەلێك بکڕن یان بیرۆکەیەك قەبوڵ بکەن کە پێویستیان بەو نەبێت، ناتوانن بە کاری بهێنن، یان توانای داراییان نییە بۆ ئەوەی ئەو شتە بکڕن: یان دوای قەبوڵ کردنی ئەو تێ بگەن کە هێندەی پێشتر بەهای نییە.

ترسی خەڵکی لە بەر ئەوەیە کە لە سەردەمی منداڵیدا، ئەوانیان بە زۆر مەجبوری کردنی کارێك یان نەکردنی کردووە. کە سودی بۆ خۆیان نەبوە یا بون بە یاری دەستی کۆمەڵگا. لە ئەنجامدا لە بەرامبەر هەر تاکێکدا کە هەوڵ بۆ ڕازی کردنی ئەوان دەدات، بە شێوەیەك وەڵام دەداتەوە. خەڵکی لە خۆیاندا گومانی خراپ دەکەن. بە نەویستن یان بە ویستن بە خۆیان دەڵێن: (( ئەم ڕووداوە ئیتر بۆ من ڕوونادات. )) ئێوە لە کاتی باس کردنی بابەتەکانتان لە کۆمەڵە بچووکەکاندا دەبێت ئەم خاڵەتان لە بیر بێت.

## کەمکردنەوەی ترسەکانی خەڵکی:

هەرکاتێك لەکاتی ناساندنی بەرهەمێك یان کەلوپەلێکن، ئەم ترسانە لە مێشکی و دڵی بیسەرانی ئێوەدا دروست دەبێت و بە ویستراوانە یان بە نەویستراوانە ئەم ترسەیان بۆ دروست دەبێت. ئەرکی ئێوە ئەوەیە کە لە کاتی قسە کردندا ئەم ترسەیان کەم بکەنەوە ولە ناوی بەرن.

لـە باسـکردنی خۆتانـدا ڕێگـەی سـوقرات بـەکاربهێنن: هەمیشـە کـە دەتانەوێت بابەتێکی گرنگ بـە تاکێـك یـان کۆمـەڵێك بناسێنن. قسـەکانی خۆتـان بـە ڕاسـتیەك دەسـت پـێ بکـەن کـە هـەموان لەسـەر ئـەم دەستپێکردنە ڕازین و قسەیەکیان نیە.

## وتووێژ لەسەر مامەڵە گەورەکان بکەن:

کاتێك لەسـەر گرێبەسـتە گـەورەکان لەگـەڵ کۆمەڵێکدا گفتوگۆدەکـەم، عادەتەن من بەتەنها لەلایەکی مێزی وتووێژەکە دەبم و ٦ تا ١٠ کـەس لـە بەڕێوبەران یان پلەو پایە بەرزەکانی کۆمپانیایەك لە لاکـەی تـری مێزەکە دەبن، هەمیشە بەدوای ئەو زانیاریانەدا دەگەڕێم سەرکەوتنی کـە چـەندین جار چێبەسپاندووە.

ئێمە عادەتەن لە سەر گرێبەست یان پێکهاتەیـەك ٣٠ تـا ٤٠ یـان هـەتا ٥٠ وەرەقەی ئیشەکەمان دەست پێ دەکەین. پێشتر لێکۆڵینەوەیەکی ورد لە سەر یەك بە یەکی بابەتەکانی گرێبەسـتەکە دەکـەم و بـەم شـێوەیە بـاش دەزانم کە کام بابەتە بۆ مـن گرنگـە و کـام بابـەتیش بـۆ لایـەنی بەرامبـەر گرنگە. پاشان ئێمە یەك بە یەکی بابەتـەکان و دێـڕ بـەدێڕی گرێبەستەکە لەگەڵ یەکدا دەخوێنینەوەو تاوتوێیان دەکەین لە ئەنجامـدا دەردەکـەوێت لەسـەر هەنـدێ لـە بابەتـەکان هـاودەنگ و هـاوبیرین، لەسـەر هەنـدێ لـە بابەتەکانی تریش بۆچوونی جیاوازمان هەیە و هاودەنگ نیین.

لـە ٨٠٪ بابەتـەکانی نێـو گرێبەسـتەکە شـایەنی بـاس کـردن نـین. بـەم شێوەیە لەلاپەڕەی یەکەمەوە تاکۆتا لاپـەڕە لەسـەر ئـەم شـێوە بابەتانـە هـاودەنگین و پێیـان ڕازیـن. کاتێـك بـە بەشـێك دەگـەین کـە هـاوڕا نـین لەسەری، گفتوگۆیەکی کورت لەگەڵ لایەنی بەرامبەردا دەکـەم بـۆ ئـەوەی

لە سەرنج وتێبینیەکانی بەرامبەرم تێ بگەم. دواتر بە ئەو یان ئەوان دەڵێم: (( باشتر نیە ئەم بابەتە وەلا بنێین و وازی لێبێنین ولە کۆتایدا لە سەری ڕێك دەکەوین؟ )) بەو شێوەیە واز لەم بابەتەدێنین و دەچینە سەر بابەتێکی تر تەواوی بابەتەکان بۆ ئەوانەی دواتر دەگۆڕین. بەم شێوە پلانە لەسەر خاڵە هاودەنگەکان لە تەواوی گرێبەستەکەدا هیچی وەستانێك دروست نابێت.

دوای ئەوەی چاومان خشاندەوە بە تەواوی گرێبەستەکەدا لەسەر زۆربەی بابەتەکان هاودەنگ یان ڕازی بووین، ئەو بابەتەی لە کاتی باس کردنیداین. ئەگەر یەکێك لەئێمە قسەی لەسەر هەمان بابەت هەبوو. باش گفتوگۆیەکی کورتی تر وگوێ گرتن بۆی دووبارە پێشنیار دەکەم کە واز لەم بابەتە بهێنرێت و بۆ بابەتی دواتر بڕۆین و قسەی لەسەر بکەین.

لە خولی دووەم لێکۆڵینەوەی بەڵگەنامەکەدا لە ٢٠٪ی ئەوەی کە ماوەتەوە چارەسەر دەکرێت. لێرەدا ئێمە لەسەر ٩٦٪ ئەو بابەتانەی کە لە بەڵگەنامەکەدا هەیە کە پێکەوە لەسەری ڕێك کەوتوین هەموان هەستێکی باشیان هەیە. هەست دەکەن کەکارەکەیان بەرەو پێش دەڕوات. ئێستە دەتوانین بۆ دواوە بگەڕێینەوە بەبێ بەکارهێنانی هەستەکان و بە چاوێکی کراوەتر لە بارەی ئەو بابەتەی کە ماوەتەوە گفتوگۆ بکەین وە ئەو ٤٪ی کە ماوەتەوە دەبێت بە شێوەیەکی ڕێك وپێك بکەوێتە ژێر قسەکردن و ڕێککەوتنەوە.

## یاسای چوار:

لە گفتوگۆی یاسایدا هەیە بە ناوی (( یاسای چوار )) لەبەر ئەمە لە گفتوگۆدا تەنها چوار بابەتی سەرەکی هەیە کە دەبێت لە بابەتی

باسکراودا هەبێت. لە هەمان کاتدا بۆ ئەوەی هەر دوو لای قسەکەر یان گفتوگۆکەر بە هاودەنگی و ڕازی بوون بگەن، دەبێت ڕیز بەندی ئەم چوار بابەتە لەلای ئەوان جیاواز بێت.

بۆ نمونە، ئەگەر بۆ یەکێك لە ئەوان نرخ و بۆ لایەکەی تری ئەوان کات گرنگ بێت، گفتوگۆکە یان قسەکردنەکە بە شێوەیەکی ئاسای بەرەو پێش دەڕوات. کاتێك کە هەر دوولا لەسەر بابەتی قسەکردن ڕێك دەکەون، کاتێك کە نرخەکان ناگۆڕرێت گفتوگۆکە کۆتای پێ دێت.

ئەرکی ئێوە جگە لە باس کردنی بابەتێك بۆ کۆمەڵێك، ڕوون کردنەوەی چواربابەتەکەیە کە لە درێژەی قسەکردنەکەتاندا بە ئەو دەگەن. دوای ئەوەی کە ڕوونتان کردەوە دەبێت بە شێوەیەك سەرنجی ئەوان بۆ خۆتان ڕابکێشن بۆ ئەوەی بتوانن ئەوەی جێی سەرنجی خۆتانە بیڵێن.

### بیرۆکەکانی خۆتان لەسەر وەرەقەیەك بنوسن:

هەر کاتێك کۆڕێکی بازرگانیتان هەیە، دەبێت بیرۆکەکانی خۆتان لەسەر وەرەقەیەك بنوسن. هەر جۆرە ناڕازییەك کە دەبێتە هۆی پێشنەکەوتن یان قەبوڵ نەکردنتان بینوسن. دواتر لە بەرامبەر هەر یەك لە ناڕەزاییەکان وەڵامێك یان چەند وەڵامی گونجاو بدەنەوە ولەسەر وەرەقەیەك بینوسن.

هەرکاتێك ڕووبەڕووی هەر پرسیارێك یان ناڕەزایەتیەك بونەوە، دەبێت بەڕێزو ڕەفتارێکی جوانەوە وەڵام بدەنەوە. دڵنیای و تواناکانی خۆتان زیاد بکەن. دواتر ئەو وەڵامانەی کە پێشتر ئامادەتان کردووە بە جۆرێك بدەنەوە کە واهەست بکەن کە لەم چەند چرکەیەدا بە مێشکتاندا هاتووە.

## هەمیشە ژیرانەو سەرکەوتوانە خۆتان نیشان بدەن:

ئەمەش تەنها بەگوتن نابێت بەڵکو دەبێت بە کردار بیسەلمێنن. لەگەڵ هەر جۆرە ناڕەزایەك و جیاوازییەك کە لە بەرامبەر ئێوەدا دەکرێت. دەبێت هەمیشە خۆڕاگرو لەسەر خۆبن. هەرچی بەنەرم و نیانی وبەجوانی ڕەفتار لەگەڵ ئەوکەساندا بکەن ئەوان ئاسانترو ڕاحەتتر لە بابەتەکان دەکۆڵنەوە و گوێتان بۆ دەگرن. ئەم پەندە گرنگەتان لە بیر بێت کە دەڵێت: (( مار بە قسەی خۆش لە کون دێتە دەر )) یان (( کەوچی‌کێکی پڕ لە شەکەر دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەرمانە تاڵەکان قوت بدەی یان بە ئاسانی بیان خۆی. ))

لە بیرتان بێت کەباس کردنی ئێوە بۆ کۆمەڵێکی بچووك گفتوگۆیەك یان وتووێژێکی ڕووبەڕووە مەبەست لەم قسەیەش ئەوەیە کە نابێت تەنها ئێوە قسەبکەن. خاڵێك یان بابەتێك کە ئاماژەی پێ بکەن وبابەتەکەتان یان خاڵکەتان کۆبکەنەوەو پوختەکەی باس بکەن. دواتر داوا لە ئامادەبوان وبیسەران بکەن کە ئەوانیش پێشنیار وبۆچی‌ونێك یان هەر شتێکیان لەسەر بابەتەکە هەیە بیڵێن. یان پرسیارەکانی بکەن.

## بەشداری بەئەوانیش بکەن:

هەرچی بەشداربوان زیاتر بەشداری پێ بکەن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەشداربوان لە دوودڵی و ترسان لە قسەکردن ڕزگار بکەن، زیاتر چالاکیان کەن هەمبۆ ئەم کۆڕەکە هەم بۆ کۆڕەکانی تریش ئەگەر لە کۆڕی ئێوشدا نەبن. باشتر دەتوانن لەهەست و بیرۆکەکانی ئەوان تێ

بکەن. ئەوانەی لە کۆتای کۆڕەکەدا زۆرتر لە ئێوە ڕازین و زۆر سوپاسگوزاری ئێوە دەبن.

## یەکگرتوی کۆمەڵەکە:

کاتێك ئێوە لەگەڵ یەك بەیەکی کۆمەڵەکە بە خۆشەویست و ڕێزێکی زۆرەوە ڕەفتار دەکەن، هەر یەك لە کۆمەڵەکە هەست بە خۆشەویستی و ڕێزێکی زۆر دەکەن بە جوانی گوێتان بۆ دەگرن. هەر یەك لە ئەوان وا هەست دەکەن یەکێکن لە کۆمەڵێك. بەڵام بە پێچەوانەوە، ئەگەر بەبێ سەبرانەو بەتورەی و بەبێ هیچی ڕێزگرتنێك لەگەڵ ئەواندا ڕەفتار بکەن، هەست بە ترس و دوودڵیەکی زۆر دەکەن گوێتان بۆ ناگرن.

## زنجیرەو پلەوپایەکانتان لە بیر بێت:

ئەگەر ئێوە لە کۆڕی بچوکی بازرگانیدان دەبێت ڕەفتاری یەکسان لەگەڵ هەموو ئەواندا بکەن، دەبێت بیرتان لە (( زنجیرەو پلەوپایە )) ی هەموو کۆمەڵەکە بێت. لە زۆربەی کۆمەڵەکاندا، یەکێك لە کۆمەڵەکە یان گروپەکە گرنگترو بە بەهاترە لەوانی کە. بیرۆکەکانی ئەم کەسە پلەوپایەدارە چی بە شێوەی قسەکردن یان بەبێ قسەکردن دەبێتە هۆی کاریگەریەکی زۆر لەسەر بیرۆکەکانی ئەوانی تر.

واتە ئەم زنجیرەو پلەوپایە لە نێو هەموو کۆمەڵەکاندا هەیە. کەسێك لە جێگەی یەکەم و یەکێکی تر لە شوێنی دووەم و یان سێیەم دایە. هەندێك لە کەسەکان کە لە کۆڕەکەدان هێزو هەڵبژاردنێکی زۆر کەمیان هەیەو یان هیچی زانیاریەکیان پێ نییە، بە پێچەوانەشەوە هەندێکیان زۆر زیرەکن و لە لوتکەی زانیاری ئەم بابەتان کە ئێوە باسی دەکەن.

ئەگەر دەتانەوێت وتاردانەکەتان کاریگەری هەبێت وبەسەد بێت بۆ ئامادەبوان. دەبێت ئەوکەسانە کە گوێیان بۆ وتارەکەتان گرتوە یان لە ژێر دەستاندان بیان ناسن ئەمەش وادەکات کە وتاردانەکەتان کاریگەریەکی باشی هەبێت. لەهەندێ بابەتدا، کەسێك کە لەسەرەتادایە زۆر کەم قسە دەکات. لە هەندێ بابەتیشدا کەسێك کە گەورەیە زۆر قسە دەکات.

## زنجیرە پلەو پایە:

لە گەشتی کۆتایمدا بۆ وڵاتە عەرەبیەکان، لەبارەی تەکنیك وزانیاریەکانی وتاردانی خەڵکی عەرەب لێکۆڵینەوەم کرد. تێ گەشتم کەسێك لەنێوان ئەواندا بێ دەنگترەو کەمتر قسە دەکات، لە هەموشیان بە تواناترە. کەسێکیش کە لە هەمویان زۆرتر قسە دەکات ودەپرسێت، کەم تواناترەو پلەوپایەیەکی کەمی هەیە.

ئەگەر لە بارەیەوە لێکۆڵینەوەم نەدەکرد، لەوە دەچۆیێت ئەو کەسانەی کە لەهەموان زیاتر قسەی دەکرد منی بخستایەتە ژێر کاریگەری خۆیەوەو من وا لە ئەوان تێبگشتایەم کە لە هەموان زانیاری زیاتری پێیە، لەکۆمەڵگای ڕۆژئاوادا، یەکەسی یەکەم زۆر یان کەم قسە بکات. لە هەمو بوارەکاندا دەبێت بزانیت لەگەڵ چی کەسێکدا قسە دەکەیت وڕێزی لێ بگریت. بیرۆکەکانی خۆتان بۆ ئەو باس بکەن، دواتر بە ئارامی سەیری یەك بەیەکی ئامادەبوانی ناو ژوورەکە بکەن لەگەڵ ئەواندا پەیوەندی سەیرکرن دروست بکەن و بەردەوام سەیری ئەوان بکەن، و هەر جارێ سەیری کەسێك بکەن. دواتر ڕاستەوخۆ بگەڕێنەوە بۆ کەسی یەکەم و

سەیری بکەن بۆ ئەوەی دڵنیابن کە ئاگای لە ئێوەیە سەرنجی ئێوە دەدات و گوێ بۆ وتارەکەتان دەگرێت.

## وتووێژی شەقامی دوولایەنەیە:

بۆنمونە کاتێک کەسانی کۆمەڵێک هاندەدەن بۆ پرسیارکردن، باسی بۆچوون و سەرکەوتن یان نارازییەکان دەکەن، ئەوان زیاتر بڕیارەکانتان بە دەست دێنن وپشتگیری لێ دەکەن.

ئەگەر ئەوان بۆچوونێکیان نەبێت و پرسیارێك نەکەن، لەڕاستیدا هەست بە هیچی پێکهێنانێك ناکەن وتەنیا بیسەرن. بەقسەنەکردن لەبەشداری نەکردتان زۆر سود وەرناگرن بەرهەمێکتان نیە. ئالفرد ئەسلوان یەکێکە لە بنیادنەرەکان، کاتێک باسی بەرهەمێك بۆ کۆمەڵێ لە بەڕێوبەران دەکات. لەکۆتای کۆڕەکەدا دەپرسێت:(( ئایا بۆچوون یان پرسیار لەم بارەیەوە هەیە؟ )) ئەگەر کەس قسەنەکات، یان ئەگەر هەمووان لەسەر جۆرو شێوەی باس کردنەکە ڕازی بن، یەکسەر دەڵێت: (( لە بڕیاری ئاشکرای کۆمەڵەکەدا دیارە کە سەرنجی ئەو بابەتە گرنگە نەدراوە کە باس کراوە. لە کاتێکدا کە هەموان لەسەر ئەم بابەتە ڕازین، دەبێت ئەم کۆڕە بۆ دواتر دوابخرێت، چاوەڕێ دەکەم لەکۆڕەکانی داهاتودا ڕەخنەو پێشنیارەکانتان ببیستم. ))لەوەی کە تێ گەشتبو و ئەوەی کە بەڕێوبەران و پێشکەشکاران فێر بوون ئەوە بوو کە کەسێ قسە نەکات یان هەموان ڕازی بن، کەواتە هیچی کەس بیری لە باسەکە نەکردوەتەوە. ئەمە مانای ئەوەی کە ئەوان دواتر دەست بەبیرکردنەوە دەکەن لەبارەی بابەتەکەوە هەر ئەمە تەواوی هەوڵ وکۆششەکان لە ناو دەبات.

له بەشێکی بەهێزدا بن:

لە کاتی دەست پێ کردنی کۆڕە بچووکەکاندا، ژوورەکە بەشێوەیەك برازێننەوە کەلەپشتانەوە دیوار بێت و دەرگاکە ڕووبەڕوتان بێت. بەم شێوە ڕێکخستنە ئامادەبوان لە کۆڕەکەدا، بەبێ وەستان و دوودڵی دەتوانن بێنە ژوورەوە وبڕۆنە دەرەوە بۆئەوەی لە هەمان هەموو ئەوان ببینن. باشترین ڕازاندنەوە بۆ کۆڕە بچووکەکان شێوەی نیوە بازنەیە کەئێوە لەسەرە کراوەکەیەوە وەستاون و بابەتەکەی خۆتان باس دەکەن. ئەگەر هەمو بەشداربوان بە شێوەی نیوە بازنەی دابنیشن ئەوا دەتوانن هەموان یەکتر ڕووبەڕوو ببینن. ئەم ڕازاندنەوە یان ئەم ڕێکخستنە بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵ بارودۆخێکدا کە کۆمەڵەکە بەشێوەی ڕێز بەرامبەر بە ئێوە دادەنیشن جیاوازە. لەم حاڵەدا هەلێك بۆ دروست کردنی پەیوەندی یان باس کردنی بۆچیونەکان بونی نییە. تەنانەت ناتوانن بۆچیونەکان بە پێکەنینەوە، برۆ یان شانە بەرز کردنە بلێن. هەمیشە هەوڵ بدەن ژوورەکە بەشێوەیەك برازێننەوە یان ڕێکبخەن کە هەموان بتوانن یەکتری و ئێوەش بە ئاسانی ببینن.

لە کاتی ڕێکخستنی کۆڕەکان، بەڕێوبەران لە دەورووبەری مێزەکە بە شێوەی نیو بازنەی دادەنیشن. هەر کاتێك خاڵێك یان پرسیارێك دەخەمە ڕوو بە چوار دەوری مێزەکەدا دەخولێمەوە ودەڕۆمەلای یەك بە یەکیان داوا لە هەمویان دەکەم کە بۆچیون و وەلامی خۆیان بلێن. ئەم ڕێگەو شێوازە لەم سالانەدا ڕێگەیەکی زۆر سەرکەوتوو بووە بۆ من. لە شێوە ڕێکخستنە یەك بەیەکی ئامادەبوان دەتوانن بۆچیونەکانی خۆیان دەربڕن و ئەوانی تریش دەتوانن سەیری ئەو کەسە بکەن گوێی بۆ بگرن کاتێك کە

قسه دەكات. بە دانیشتن لە دەوروبەری مێزەكە باسێكی كاریگەرو قوڵمان دەبێت.

## هەنگاوی دواتر ڕوون بكەنەوە:

لە بیرتان بێت ئامانجی وتاردان، بچووك گەورە، سەركەوتنە بە سەر زۆربەی هەنگاوەكانتاندا. لە بەردەوام بونی گفتوگۆ دەبێت ئەم پرسیارانە بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ بكەن و بپرسن: (( لەم كاتەدا دەبێت چی هەنگاوێك بنێین و جێ بەجێی بكەین؟ لە بارەی ئەم بابەتەوە ئیشێك دەبێت جێ بەجێ بكەین؟ بە شێوەیەكی ڕێككەوتنانە لەسەر ئەم بابەتە هەنگاوی دواتر چی دەبێت؟ ))

كاتێك كە وتاردانتان بۆ كۆمەڵێك هەیەو بەنیازن هەنگاوێكی ڕێكخراو جێ بەجێ بكەن پێویستە لەسەرتان ڕێك بكەون لەسەر ئەوەی كە چی كەسێك بەرپرسیارەو چی كاتێك دەبێت كارەكە تەواو ببێت. لە زۆربەی باشترین وتارەكانتاندا لەسەری ڕێك دەكەون بەلام لەئەنجامدا لە كاتی جێ بەجێكردندا هیچی شتێك ڕوو نادات. هۆكارەكەشی ئەوەیە هیچی كەسێك وەك بەرپرسیار بۆ جێ بەجێ كردنی كارەكە لە كاتێكی دیاریكراودا دیاری نەكراوە.

لە شێوەیەكدا كە ئێوە كەسی ڕوون كەرەوەن، تەنانەت ئەگەر ناچیاریش بن كە قسەكانی خۆتان دووبارە بكەنەوە، توانای ئێوە لە سور بون و دڵنیا بون لە جێ بەجێ كردنی ئەم هەنگاوانە، وتاردان و پلاندانانی ئێوە بە بەهاتر دەكات.

## وتارەکەتان بە شیوەی دەنگ و ڕەنگ پێکەش بکەن:

لە هەموو کۆمەڵەکاندا، نزیکەی ٧٠٪ی بەشداربوان بینەری تەوەرەکەن و٣٠٪ی کە ماوەتەوە بیسەری تەوەرەکەن. کۆمەڵەی لە ٧٠٪ی هەمان بینەران، دەبێت خاڵەوبابەتاکان و نمونەکان بە شێوەی جوان ببینن بۆ ئەوەی بتوانن بەباشی لە قسەکانی ئێوە تێ بگەن و قسەکانتان قەبوڵ بکەن، لە ٣٠٪یەکەی تر، واتە بیسەرانی تەوەرەکان، دەتوانن بە گوێ گرتن بۆ وتارەکەتان لە زانیاری قسەکانتان تێ بگەن.

لە ئەنجامدا لە ٧٠٪ی بیسەرانی ئێوە تەنیا کاتێك لە قسەکانی ئێوە تێ دەگەن کە نمونەیان بۆ بهێننەوە. یاسای کۆڕەکەی خۆتان بنوسن بۆ ئەوەی ئەم کۆمەڵە زۆرە لە کۆڕو وتاردانەکەتان تێ بگەن. دەتوانن کاتێك خاڵێك باس دەکەن. دەتوانن سود لە پاوەرپۆینت وەرگرنو خاڵەکانی پێ نیشان بدەن. لە هەمان کاتدا دەتوانن سود لە تەختەڕەش وەربگرن بۆ نوسینی خاڵ و زانیاریەکانی بابەتەکە. کۆمەڵەی بینەرانی تەوەرەکە بە (( بینینی )) ئێوە لەکاتی وتارداندا هەست بە ئارامی دەکەن. لەلایەکی تر بیسەرانی تەوەرەکە، لەسەر ئەوەی بە بینینی زانیاریەکان و نوسینەکان ڕازین، بەڵام زۆرتر حەز دەکەن ئەو قسانە ببیستن، هەروەها لە بارەی واتای ئەو دەستەواژانەی کە بەکاری دینن پرسیار دەکەن. بۆیە ئێوەش دەبێت بەجوانی خۆتان ئامادە بکەن.

## نیشان بدەن، بڵێن وپرسیار بکەن:

کاتێك دەستم بە سیمینارەکە کرد، کۆڕەکانی خۆم بە خاڵە گرنگەکان دەست پێ دەکەم، دواتر لە تەختە ڕەش یان لە پاوەرپۆینت سود

وەرگرم، وەها ئامێرێك كە ئەم هەڵبژاردنە بە من دەدات بۆ ئەوەی خاڵە گرنگەكان لە كاتی نوسینیاندا لەسەر پەردەیەك كەلە پشت یا لە تەنیشت مندایە نیشان بدەم.

لە كاتی وتاردا، خشتەكان و وێنەكان وبابەتەكانی تر وێنا دەكەم كە خاڵە گرنگەكانی وتاردانەكە بە شێوەیەك نیشان دەدات. كاتێك لەسەر ووشەیەك یان بابەتێك سور دەبم، بە ڕوونی دەینوسمەوە بەم شێوە ڕێكخستنە ئامادەبوان دەتوانن بیان بینن.

لە ئەنجامدا، خەڵكی زانیاری زۆر دەنوسن. لەوكاتەی كە شتێك دەنوسن، بیسەران وا بیردەكەنەوە كە ئەو بابەتە گرنگە بەو شێوەیە ئەوانیش هەمان بابەت دەنوسنەوە. ئەمە وادەكات بۆ ئەوەی ئەوان لە تەواوی سیمینارەكەی ئێوەدا ئامادەبن.

ئەگەر تەنها قسە بكەن، بێجگە لەوەی كە هیچی شتێك بنوسن یا نمونەیەك بهێننەوە، تەنانەت زۆربەی مێشكەكانیش ٨٠ تا ٩٠٪ قسەكانی ئێوە لە كۆتای وتاردانكەدا لە بیر دەچیەنەوە. بە قسەكردن و نوسین، ئاگات هەم لە بینەرانی تەوەرەكەو هەم لە بیسەرانی تەوەرەكە دەبێت. بەم شێوە ڕێكخستنە وتارەكانی خۆتان بە سود و گرنگ دەكەن بۆ بیسەران و بینەرانی وتارەكە.

## بەباشی خۆتان ئامادە بكەن:

كاتێك كەسێك لە ئامادەبوان پرسیارێك دەكات یان باسی بابەتێك دەكات، ئێوە دەبێت دوو كار بكەن مەگەر ئەوەی كە پرسیار یان بابەتی باسكراو لەلای ئەو بە تەواوی ڕوون بێت. یەكەم جار، پێش وەڵام دانەوەی پرسیارەكە یان بابەتەكە، دەبێت ئەو بابەتو پرسیارە بە مێشكی خۆتان

باس بکەن یان بە مێشکی خۆتان بۆ خۆتانی ڕوون بکەنەوە. بۆ ئەوەی بە تەواوی لە بابەت و پرسیارەکە تێ بگەن. دوای ئەوەی خۆتان لێی تێگەشتن بۆ ئەوی ڕوون بکەنەوە بۆ ئەوەی بزانن بە تەواوی لە مەبەستی تێگەشتون. دەتوانن بڵێن: (( مەبەستی ئێوە لەم پرسیارە. . . . . . . . . ئەمە بوو؟ ))

دووەمین شێواز بۆ وەڵامدانەوەیەکی ڕاست ودروست. ئەوەیە کە داوا لە کەسەکە بکەن پرسیار یان بابەتەکە بە شێوەیەك بڵێت کە ئێوە بتوانن بەباشی لێی تێ بگەن. هەرکاتێك لە پرسیار یان بابەتێك تێ نەگەشتن ولەلاتان زۆر ئاڵۆز بوو، دەتوانن ئێوە ئەم پرسیارە بکەن و بڵێن: ((مەبەستی ئێوە چییە؟ )) خراپترینکارێك کە دەیکەن ئەوەیە کە وەڵامی پرسیارێك بدەنەوە کە بەجوانی یان هەر لێی تێ نەگەشتون.

پوختە:

لە ئەمڕۆوە بڕیار بدەن کە بەشێوەیەکی تەواو ئامادە بن. لە هەر وتاردانێکدا هەرچی لە تواناتاندایە بیکەن یان بیڵێن. لە بیرتان بێت کۆمەڵێك کە دەتوانن لەسەر کارەکەی ئێوە کاریگەرییان هەبێت لە کاتی سەیر کردنی ئەزمونەکانی ئێوەدان.

هەر کاتێك لە کۆمەڵێکدا دەست بە قسە دەکەن، بۆ هاندان یان بۆ نارەزای وە یان. . . . . . . . دەبێتە هۆی پێشکەوتن یان دواکەوتنی خۆتان دەبێت چاوەڕێی هەموو شتێك بن!

## بەشی حەوتەم



## زاڵ بوون بەسەر تەمەندا: کاریگەری بڕیاردان لەسەر بیسەران

گەورەترین وباشترین ئارەزووەکانتان بۆ خۆتان هەبێت. ئارەزوو گەلێك کە حەز بەپێشکەوتنی دەکەیت. هەواڵی ئێوە مژدەیەکە لەسەر ئەو ئارەزوانەی کە ڕۆژێك لە ژیانتاندا پێشکەوتن بەخۆیەوە دەبینێت.

" جیمز ئالن"

ڕۆژێ لە ڕۆژان بەرنامە داڕێژەرێکی پەیوەندی بەوتاردەرێکی بە ئەزمونەوە کرد بۆ ئەوەی کاتێکی گونجاو دابنێت بۆ وتاردان. یەکەم پرسیاری بەرنامە داڕێژەرەکە کە کردی ئەمە بوو: (( حەقی زەحمەتتان چەندە؟ )) وتاردەر وەڵامی دایەوە: (( پەیوەندی بەوەوە هەیە کەدەتەوێت ماوەی وتاردانەکە چەند بێت پەیوەندی بەو ماوەیەوە هەیە کەمن خۆمی بۆ ئامادە دەکەم.))

ئەو دواتر پرسیارێکی تری کردوو وتی: (( تێ چوونی ٣٠خولەك قسەکرد و ئامادەی بۆ ئەو چەندە)) وتاردەر وەڵامی دایەوەو ئەمەی پێ گوت: (( شەش تا هەشت کاتژمێری پێویستە بۆ خۆ ئامادەکرنێکی باش بۆ وتاردانێکی٣٠خولەکی کاریگەر و ٥٠٠٠ هەزار دۆلار تێ چوونی هەیە.))

بەرنامە داڕێژەرەکە بە سەرسوڕمانەوە پرسی:(( کەواتە تێ چوونی نیوە ڕۆژێك یان تاقێك قسەکردن و ئامادەبون چەندی تێ دەچێت؟ ))

وتاردەر وەڵامی دایەوەو ئەمەی گوت: (( بۆ نیوە ڕۆژێك یان تاقێك قسەكردن و سێ تا چوار كاتژمێر دەبێت بۆ پێكهێنان و خۆ ئامادەكردن دانێم تێ چیونەكەشی ٤٠٠٠ هەزار دۆلار دەبێت. ))

(( ڕۆژێكی تەواو قسەكردن چۆنە، تێ چوونی ئەو چەندە و چەند كاتی دەوێت بۆ پێكهینان و خۆ ئامادەكردن؟ ))

وەڵامی وتاردەر بەم شێوەیە بوو:(( ئەها، ئەگەر وتاردان بۆ ڕۆژێكی تەواوە، لە ئێستاوە دەتوانم دەست پێ بكەم. ))

## وتاردان هەرچی كورت تر بێ كێشە ترە:

مەبەستی من لە باس كردنی ئەم باسە لە سەرەتای بەشەكەوە ئەوە بوو كە هەرچی كاتەكە كورت تر بێت، بەهۆی ئەوەی كە بارودۆخەكەو كاتەكە دیاری دەكرێت كاتەكەش لەوەدەچیێت كورت بێت. بەهۆی ئەوەی كە بارودۆخەكە سنور داردەبێت خۆ ئامادەكردن بۆگەیاندنی مەبەستەكەت كاتێكی زۆر دەوێت. ئەگەر بڕیار بێت كە تەواوی ڕۆژەكە قسە بكەیت، دەتوانن كاتەكانی خۆتان بە چیرۆكەكان، نمونەكان وئامارە كردن بە جیاوازییەكان پڕ بكەنەوە، ئەگەر تەنها ٢٠ خولەك كاتتان هەبێت بۆ گەیاندنی مەبەستەكانتان دەبێت زۆر شیاواوی یان گونجاوانە لە سەر بابەتەكان ورد بن ودەبێت لەو كاتە دیاریكراوەدا مەبەستەكەی خۆتان بگەیەنن.

یەكەمین وتاردانی من بۆ بیسەران ژمارەیان ٧كەس بوو. بەڵام دوای تێ پەڕ بوونی كات. جارێك بۆ ٢٥٠٠٠ هەزار كەس قسەم كرد. جارێكی تر بۆ ٨٥٠٠٠ كەس قسەم كرد كە ٢٠٠٠ كەس لەوان بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ و ٨٣٠٠٠ هەزار كەسی تر لە ٦٠٠ شوێنی تر لە ڕێگەی سەرتەلایتەوە

بیسەرو بینەری من بوون. کاتێ وتاردنەکان وکۆڕەکانی من لە ٢٠ خولەکەوە تا ٣و٤ ڕۆژ دەست پێ دەکات.

هەر وتاردانێکم کە هەبوو بێ، تەنها بۆ یەك جار یان زیاتر، دەبوایە خۆم بۆ یەك بەیەکی بابەتەکان ئامادە بکردایە وبە وردی ڕاهینانم دەکرد بۆ ئەوەی بتوانم باس کردنەکەم باش و کاریگەر بێت. هەرچی ژمارەی بیسەرەکانتان زیاتر بێت، دەبێت وەك وتاردەرێك ڕاهێنانی زیاتر بکەیت. قسە کردن بۆ ژمارەیەکی زۆر لە بیسەران جیاوازە لە قسەکردن بۆ ژمارەیەکی کەم یان کۆمەڵەیەکی کەم.

## هەشت بەشی وتاردانێکی کاریگەر:

بە هەمان شێوەی کە لە بەشی یەکەمدا وتم، ٢٠ تا ٦٠خولەکی بۆ کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵکی، هەشت خاڵ یان هەشت بەش بوونی هەیە کە دەتوانن سودیان لێ وەرگرن بۆ خۆئامادەکردن و ڕێکخستن. مۆڵەت بدەن کە جارێکی تر ئەو خاڵانەتان بە بیر بهێنمەوە.

١)دەست پێ کردنی بابەتەکە: لەم کاتەدا ئێوە سەرنجی بیسەران بۆ لای خۆتان ڕابکێشن وئەوان ناچار دەکەن کە چاوەڕێی بیستنی قسەکانی تریان بەشەکانی تر بن.

٢)دەستپێك یان پێشەکی: کاتی ڕۆشتن بۆ یەکەم خاڵی قسەکردنی ئێوەیە.

٣)بابەتی یەکەم: لەم کاتەدا بابەتی یەکەم باس بکەن.

٤)ڕۆشتن بۆ بابەتی دووەم: لەم کاتەدا ئێوە ئامارە بە ڕۆشتن بۆ بابەتی دووەم دەکەن.

٥)دووەم خاڵی سەرەکی: سروشتیەن ئەم خاڵە یان ئەم بابەتە بە دوای بابەتی یەکەمدا باس دەکرێت.

٦) ڕۆشتنێکی تر: کاتی باسکردنی خاڵی سێیەمە.

٧)سێیەمین خاڵ: بەردەوامبونی بابەتی یەکەم و دووەمە.

٨)پوختە: لەم خاڵەدا ئێوە باسەکەی خۆتان کۆ دەکەنەوە ولە بیسەرانی خوتانتان دەوێت کە دەس بەکاربن.

## حەوت خاڵی گرنگ لە وتارداندا:

بەمەبەستی نوسینی وتار لە هەر بوارێکدا بۆ هەر بیسەرێك، لە هەر وتاردانێکدا دەتوانی بۆ هەر یەك لەم حەوت بابەتە لە ١ تا ١٠ دەرەجە بدەن. دەرەجە کەم دان بە هەر وتاردەرێك بۆ هەر بابەتێك نیشانەی لاوازی و کاریگەری نەبوونی ئەو بابەتەیە.

## پێشەکی ودەستپێکردنی بابەت:

زۆر گرنگە لەسەرەتای وتارداندا کاریگەریەکی باشتان هەبێت لەسەر بیسەران. یەکەمین کاریگەری لەسەر بیسەران پێش لە وتاردان دروست دەبێت. کارەکەی خۆتان بە ووتنی ووشە بەووشەو وتاردانی خۆتان وتاردانی خۆتان لەسەر وەرەقەیەك دەست پێ بکەن. بە هەمان شێوەی کە لە بەشی دووەمدا ڕوونم کردوەتەوە. تەواوی بۆچیونەکانتان لەسەر وەرەقەیەك بە تەواوی بنوسن. ناونیشانی وتارەکە لە سەرەوەی وەرەقەیەك بنوسن و دواتر هەموو ئەوبابەتانەی کە دەتانەوێت باسی بکەن یان پەیوەندی بەم باسەوە هەیە لە ژێر ناونیشانەکەدا بنوسن. زۆربەی کاتەکان ڕوون کردنەوەی بۆچیونەکان بە دوو تا سێ لاپەڕە دەگات.

دوای تـەواوکردن وباسـکردنی بۆچـوونەکان، پێداچـوونەوە بـۆ خاڵـە جیاوازەکـان بکـەن، تـەواوی وتارەکـەی خۆتـان تۆمـار بکـەن و لەبـەری بگرنـەوە. بۆشـای نێـوان دێڕەکـان دووبەرابـەری بۆشـای ئاسـای بێـت بۆئـەوەی بـە ئاسـانی چـاوپێدا بخشـرێنرێتەوە هێنـدە چـاوبە وتارەکـەی خۆتاندا بخشێننەوە و ڕاهێنانی لەسەر بکەن. بۆ ئەوەی لە کاتی باس کردنی بابەتەکەو دەربڕینی ووشەکاندا هیچی کێشەیەکتان نەبێت.

بۆ دڵنیا بوون لە کاریگەری باش بە سود لەسەر بیسەران دەبێت چەند کارێکی تر جێ بەجێ بکەن.

## هۆڵی وتاردانەکە بە تەواوی ئامادە بکەن:

دووەمین بەش بۆ کاریگەر بوون لەسەر بیسەران ئەوەیە کە زوو بگەنە هۆڵی وتـاردان، تەقریبـەن ڕۆژێك پێشـتر، بچـنە هـۆڵی وتاردانەکـەوە و پیاسەیەك بکەن لە ناو هۆڵەکەدا بۆ ئەوەی شوێنی وتارەکە لە کاتی وتاردانتاندا نامۆ نەبێت و ڕابێن لەسەری.

سەر شانۆ ( مەصرەح ) و سیستەمی دەنگی، ڕوناکی، شوێنی دانیشتنی ئامادەبوان بپشکنن. هـەرگیز وا بـیر نەکەنـەوە کـە کەسێکی تـر بتوانێت وەك ئێوە چاودێری شتانی ناو هۆڵەکە بکات، لەبیرتان بێت، زۆربەی ئەو کەسانەی کە کاری ڕێکخستن و بەڕێوبەری ئەو شتانەن کە پەیوەندی بە هۆڵی وتاردانەکەوە هەیە، بە دڵنیایەوە دەسکەوتێکیان هەیە وە تەنیا ئامانجیان جێ بەجێ کردنی کارەکەتەو بەجێ هێڵانی شوێنەکەیە.

ئەمە دەزانم کە ماوەیەك لەمەو پێش بەمەبەستی وتاردانێکی ٩٠ خولەکی بۆ ٤٠٠٠ کەس لە بەڕێوبەران و ئیش کەران ویان کرێکارانی کۆمپانیایەکی نێودەوڵەتی بانگهێشت کرابووم. کۆڕەکە سێ ڕۆژە بوو کۆمپانیا ئەرکی

پاراستنی هۆڵەکەو ئەو شتانەی کە لە ناویدان بە کۆمەڵێك لەکارزانان سپارد ئەو شتانەش وەك دەنگ، ڕەنگ وکورسیە. من لە نێوان دووەمین ڕۆژدا و لەکاتی نانی نیوەڕۆدا گەشتم. من زوو گەشتم چەند باش بوو کە زوو گەشتم.

شێوازی وتاردانی من بەم شێوەیە لە کاتی قسەکردندا هەندێك لەو بابەتانەی کە لێکۆڵینەوەم لەسەر کردووە ونوسیومەتەوە بە ئامێری نیشاندان نیشانی ئامادەبوانی کۆڕەکەی دەدەم.

من لە ناوەڕاستدا دەوستم وئامێرە نیشان دەرەکە لەلای ڕاستم دادەنێم بۆ ئەوەی بتوانم لە کاتی قسەکردندا بابەتەکان بگۆڕم ولەگەڵ ئەواندا پەیوەندیم هەبێت و ڕاستەوخۆ سەیریان بکەم.

لەم وتاردانەدا، لێپرسراوانی ئەم کارە ئامێرەکەیان لە پشتمەوە دانا بوو واتە ئەگەر بمویستایە بابەتەکان بگۆڕم دەبوایە پشتم لە ئامادەبوانی کۆڕەکە و بیسەران بکردایە. لە کۆتایدا بە ئەوانم گوت یان بۆم ڕونکردەوە کە لەم بارودۆخەدا ئەگەر بمەوێت لەسەر ئامێرەکە بابەتێکی تر نیشان بدەم دەبێت لە پێش مەسرەحەکەوە بۆ دواوە بڕۆم وپشت لە ئامادەبوان وبیسەران بکەم ئەمەش کارێکی نەگونجاو ئاڵۆزە، بەڵام ئەوان تەنیا شانەکانیان بەرزکردەوەو ئەسڵەن ئەم قسەو بابەتەیان لا گرنگ نەبوو. داوام لە ئەوەان کرد کە ئامێرەکە بخەنە شوێنێکەوە کە بتوانم لەگەڵ بیسەراندا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆم هەبێت واتە ڕووم لە ئامادەبوان وبیسەران بێت. بەو شێوەیەی کە هەولّم داو خۆم هۆڵەکەم ئامادە کرد وتاردانەکەم زۆر بەباشی بەڕێوە چیوو.

## چاوپێکەوتن لەگەڵ بیسەرانی خۆتاندا بکەن:

پێش لەوتاردان، لەگەڵ پێکهێنەرەکانی کۆڕەکە، میوانەکان، لەگەڵ هەندێ لە ئامادەبوان چاوپێکەوتن بکەن. لەپێشدا خۆتان بناسێنن ودواتر ناوی ئەوان بپرسن وهەوڵ بدەن هەندێك زانیار لەبارەیانەو بەدەست بهێنن.

ئامادەبوان هەمیشە لە قسەکردن لەگەڵ وتاردەردا وپرسیارکردن لێیان چێژوەردەگرن. ئامانجی ئێوە دروست کردنی هەستێکی وەهایە لە نێوان ئەواندا. ئێوە دەتانەوێت لەبیروهەستەکانی ئەوان ئاگادار بن وتێ بگەن. سەرەڕای هەموو ئەمانە ئێوە دەتانەوێت ئەوان واهەست بکەن کە ئێوە وئەوان لەیەك ئاستدان.

## گوێ بۆ وتاردەرانی تر بگرن:

ئەگەر وتەکەی ئێوە دوای وتاردەرانی چەند وتاردەرێکی ترە، زوو گەشتن وگوێ گرتن بۆ وتاردەرەکانی تر جێگەی گرنگیەو سودێکی زۆری بۆتان هەیە. زانینی ئەو زانیارانەی کە پێش وتاردانەکەی ئێوە بە بیسەران وتراوە، زۆر پێویستە.

هەندێ جار وتارەکانی من کۆتا وتاری پێش نانی نیوەڕۆیە، میوانەکان دەڵێن: (( لەبەرئەوەی وتاردانەکەی ئێوە کاتژمێر ١١دەیە پێویست ناکات زوتر لە کاتژمێر ١٠:٣٠ لێرە بن. ))کاتێك کە یەکەمین وتاردەر دەست بە وتاردانەکەی دەکات، عادەتەن ئەو کاتەش کە بەڕێوبەری کۆمپانیا یەکەمین بابەتی ڕۆژەکە باس دەکات لە بەردەم دەرگای ژوورەکەدام. کاتێك کە سەرەی وتاردانەکەی من دێت، دوای ناساندنی خۆم، ئاماژەیەك بە قسەکانی وتاردەرەکەی پێشو دەکەم، بەتایبەتی ئەگەر بەڕێوبەرە

گەورەکە ئامـاژە بـە زانیارییـەکی گـرنگ بکـات. مـن قسـەکانی وتـاردەرە پێشوەکە تا ڕادەیەك دووبـارە دەکەمـەوە وەك ئـەوەی کـە (( کاتێك کە بەڕێز ڕابـرت وێڵسون ئاماژەی بەم خاڵـە زۆر گرنگـە کـرد. . . . . . . . )) و منیش لە بارەیەوە قسە دەکەم.

بەئەم ئیشەتان بیسەران تێ دەگەن کە سـەرنجدانی تـەواو بـە وتارەکانی ئێوە گرنیگیەکی زۆری هەیە بۆ وتاردەر.

بە گوێ گرتن بۆ وتارەکانی پێشوو هۆکارێکی ترە بـۆ ئـەوەی بـزانن چی شتانێك یان زانیاریەك وتراوەو چی زانیاری وبابەتێکیش نـەوتراوە. ئەگەر گوێ بۆ وتاردەرکانی پێشـتر نـەگرن لەوانەیـە زۆربـەی ئـەو قسانەی کە دەیکەن ئەو قسەو بابەتانەی پێشتر بێـت کـە وتاردەرکـانی پێشتر باسی کردبێـت. هـەر لەبەرئـەم هۆکـارە زۆربـەی وتارەکـەتان لـەلای بیسـەران دووبارەیە وبیسەران گوێ بۆ قسەکانتان ناگرن.

بۆ نمونە، لەبیرمە کە لە شیکاگۆ بۆ ٢٠٠٠کەس وتارم هەبوو. وتاردانەکەی مـن دوای نـانی نیـوەڕۆ بـوو. بـەڵام مـن لـە سـەعات ٨:٣٠ لـە یەکـەمین وتارداندا لە هۆڵەکەدا ئامـادەبووم یەکـەمین وتـاردەر وتارەکـەی لـەبارەی بابەتانێکی زۆر گرنگ وبەسود قسەی کردو بەقسەی پێکەناوی کۆتـای بە وتارەکەی هێنا.

پێش لە ناساندنی دووەمین وتاردەر، پشویەکی ٢٠ خولەکی بە وتاردەران وبیسەران درا. دووەمین وتاردەر لەکاتی وتاردانەکەی خۆیدا هـاتوو خۆی نەخستبویە ناڕەحەتیەوە کە لە یەکەمین وتارداندا ئامادە بێت. ئەو کاتێ گەشتە هۆڵکە کە دەبوایە بڕۆشتایەتە سەر شانۆ. ئەو ئەوبابـەتو قسانەی کـە دیـاری کردبـوو بـەڕێکو پێکـی تـەواوی کـرد. بـەڵام ئـەوەی جێگـەی

سەرسوڕمان بوو كەلە كۆتای وتارەكەیدا هەمان قسەی پێكەنیناوی وتاردەری یەكەمی كرد. ئەم جارەیان ژمارەیەكی كەمی ئامادەبوان وبیسەران پێكەنین، ئەوانی تریش كە مابونەوە لەم قسە دووبارەیە بێزار بوون وناڕەحەت دەكەوتنە بەر چاو. دەتانتوانی لەشێوە ودەموچاوی وتاردەر تێ بگەن كە لەپێنەكەنینی تەواوی بیسەران سەری سوڕما بوو.

دواتر خراپترین شتێك چاوەڕوانی ناكرێت ڕوویدا. سێیەمین وتاردەریش كە هەر وەك وتاردەری دووەم لە هەمان كاتدا گەشت كە دەبوایە بڕۆشتایەتە سەر شانۆ واتە لە وتاردانەكەی پێش خۆیدا ئامادە نەبوو. ئەم وتاردەرە بەڕێزەش دوای تەواوكردنی قسەوباسەكانی خۆی ئەمیش هەر بەهەمان قسەی پێكەنیناوی كۆتای بە وتارەكەی هێنا وهەمان قسە سێ بارە كرایەوە.

ئەم جارەیان، بیسەران بە تەواوی بێدەنگ بوون. هیچی كەس هەستی بەوە نەكرد كە وتاردەر مەبەستی ئەوەیە كە دڵی ئەوان خۆش بكات وبیان هێنێتەپێكەنین. لە ڕاستیدا بیسەران بۆیان ڕوون بویەوە كە وتاردەران قسەكانی وتاردەرانی پێشویان نەبیستوە. بەسەیركردنی شێوە ودەموچاوی بیسەران دەتوانی لەوە تێ بگەیت كە وتاردەران خۆیان لەوانی تر بە زیاتر دەزانن. بۆیە ئامادە نابن لە وتاركانی وتاردەرانی پێش خۆیاندا. لە ئەنجامدا ئەوان نەیان توانی سەركەوتوو بن. بۆیە دەڵێم لە وتاردانەكانی پێش خۆتاندا ئامادە بن.

## چاوپێكەوتن لەگەڵ ناسێنەرەكەی خۆتاندا بكەن:

بۆ دڵنیابون لە پێشەكیەكی باش وبەهێز، ناسینی خۆتان ببینن و چاوپێكەوتنی لەگەڵدا بكەن. بە دڵنیایەوە دەبێت پێشەكی یان دەسپێكی

خۆتـان استنسـاخ بکـەن و بیـدەن بـە ئـەو بـۆ ئـەوەی بیخوێنێتـەوە. لـە سەرەوەی لاپەڕەکەوە ئەمـە بنوسـن: (( تکایـە ئـەم نوسـینانە بـە وردی بخوێننەوە. )) دەستپێکی لاواز، خراپ بخوێنرێتەوە، وەك ئـەوە وایـە کـە دیوارێك هەر لەسەرەتاوە بناغەکەی دروست نیە.

زۆر سەرنج ڕاکێشە کە زۆربـەی کاتـەکان ناسـێنەرانی وتـاردەران بـە بێ ئەوەی هیچی شتێك لەو لاپەڕەیـە بخوێننـەوە کـە وتاردەرەکـە پێـی دان، دەەڕۆنە سەر شانۆ و ئەوان زۆربەی کات دەقی ناساندن بـە دەسـت وپـێ شکاوی دەخوێننەوە و لەکاتی ناسندا دووچیاری هەڵەو زمـان دەبنـەوە. ئێوە بە دڵنیا بوون لە بـاش نوسـینی دەقـی ناسـاندنتان دەتـوانن ڕێ لە نائـارامی بیسـەران بگـرن. کەواتـە ئەگـەر ناسـێنەرەکەی ئێـوە کارەکـەی خۆی بەباشی جێ بەجێ نەکرد، نابێتە هۆی زیان گەیاندن بە ئێوە.

## کاتی نیشان دان!

کاتێك کە ناسێنران، هەناسەیەکی قـوڵ هەڵمـژن بـە باوڕبەخۆبونـەوە وبـە ئازایانەو بەبێ ترس بۆ سەر شانۆ بڕۆن. لە هەمان کاتدا ئـەو کەسـەی کە ئێوەی ناساند سوپاسی بکەن چی بەتەوقـە کـردن یـان چـی بـە لـەباوش کردن بێت. بەشانە ڕێکـەکانتان بەرامبـەر بـە بیسـەران ڕاوەسـتن ولەگەڵ ئەواندا پێبکەنن.

بۆ چەند چرکەیەك هیچی مەڵێن وبێ دەنگ بـن چـاوەڕێی ئـەوە بکـەن کە لەگەڵ ئێوەدا ڕابێن وسەرنجی ئێوە بدەن. شوێنی بیسـەران وئامادەبوان بۆ چوار بەش دابەش بکەن (دوو بەش لە پـێش ودوو بـەش لـە دواوە) بە ئارامی چاوبگێڕن بەسەر ئەم بەشانەدا. کەسـی نێوەنـدی هـەر بەشێك

دیاری بکەن هەرجارێك کە گەشتنەوە ئەو بەشە، سەیری هەمان کەس بکەنەوە.

بە باس کردنی هەر ڕستەیەك کە پەیوەندی بە کێشەو ناڕەحەتی بیسەرانەوە هەیە، سەرنجی ئەوان بۆ خۆتان ڕابکێشن. بۆنمونە، کاتێك بۆ فرۆشیاران یان بازرگانان قسە دەکەم، زۆربەی کات بە وتنی ئەم ڕستانە قسەکانی خۆم دەست پێ دەکەم:

هەواڵ گەلێکی خۆشم بۆ ئێوە هەیە ( هەندێك بێ دەنگ دەبم ). ئێمە لە باشترین بەشی مێژووی مرۆڤایەتیدا دەژین (هەندێك بێ دەنگ دەبم). زۆربەی خەڵکی بە بەراورد ئەو خەڵکانەی کە لە سەردەمانی پێشتردا ژیاون، پارەیەکی زیاتر بەدەست دێنن. ئەرکی ئێوە ئەوەیە کە یەکێك لەوان بن و ئەرکی منیش نیشاندانی ئەو ڕێگەیە کە بگەن بەو شوێنە.

کاتێك سود لەم دەست پێ کردنەم دەگرم، سەرنج و حەزی بیسەران زیاتر دەبێت. خەڵکی چی بە مێشکیان یان چی بە جەستەیان ڕێزی خۆیان نیشان دەدەن و بۆ گەشتن وبەدەست هێنانی ئەم ئامانجە بە باشی گوێم بۆ دەگرن.

## مەبەستی خۆتان بگەیەنن:

بابەتی وتاردانی ئێوە هەرچی بێت. دەبێت بە جوانی مەبەستەکانتان بگەیەنن. دڵنیا بن لەوەی کە بیسەران بۆ قسەکانتان بە باشی گوێ دەگرن، حەزیان لێیەو لە ژێر کاریگەری قسەکانی ئێوەدان.

## هەریەك لەخاڵەکان بە چیرۆکێکەوە ببەستنەوە:

هەرکاتێك بۆ تێگەیاندنی خاڵێك چیرۆکێك باس دەکەن، حەتمەن دووبارە ئەو بەو خاڵەوە ببەستنەوە، بۆ نمونە، کاتێك من بۆ دەست پێ کردن لە پێشەکیەك کە پێشتر گوتومە سود وەردەگرم، هەمویان خۆیان لار یان کوڕ دەکەنەوە و چاوەڕێی بیستنی بەشەکەی تری چیرۆکەکە دەکەن. لەوانەیە دوای ئەوە بۆیان ڕوون بکەمەوە کە ئەسکەندەر چۆن لە ئەردەبیلدا داریوشی تێکشکاندو دواتر نێردرا بۆ داگیرکردنی جیهانێکی نەناسراو.

لە بەردەوامی قسەکانمدا. لەبارەی تایبەتمەندی سەرۆکێك وەك ڕوانگەو ئازادی وخۆگری وبەرپرسیاری قسە دەکەم. لەکۆتای وتارەکەدا، هەریەکێك لەبەڕێوبەران دەبێت خۆیان بە ئەسکەندەرێکی شیاو بزانن کە لە بەرامبەر ڕکابەرەکانیدا ڕکەبەرایەتی دەکرد.

## مێشکی خۆتان بەتەواوی چالاك بکەن:

لە ڕاستیدا کەجایزەی نۆبڵی برد گوتراوە مێشکی مرۆڤ لە دوو بەش پێك دێت کە ئەوانیش بەشی لای ڕاست وبەشی لای چەپە. بەشی لای چەپ بۆ مەسەلەی ناوخۆی، بەکاربردەی، لێکدانەوەی ڕاستیەکان. . . . . . وهتد بەکاردێت ئێمە لەم بەشەی مێشك بۆ بەدەست هێنانی هەر جۆرە زانیاریەك سود وەردەگرین. لەلایەکی ترەوە، بەشی ڕاستی مێشك بە وێنەکان و، سوز، مۆسیقاو چیرۆکەکان. . . . . . . و هتد چالاك دەبێت.

خەڵکی بە بەشی لای ڕاستی خۆیات بڕیار دەدەن. ئەرکی ئێوە ئەوەیە تا جێگایەك کە دەتوانن مێشکی لای ڕاستی ئەوان چالاك بکەن. هەرچی لە قسەکانی خۆتانەوە زیاترئەوان هان بدەن. ئەوکاتە بیسەران زیاتر گوێ بۆ ئێوە دەگرن. ڕێگەی (( فلچەی سەیارە ))تان لە بیر بێت.

بە هەمان شێوەی کە قسەکانی خۆتان بە ڕاستیەکان وچیرۆکەکانەوە دەبەستنەوە، ئاگاتان لەکەسی نێوەندی هەر بەشێك بێت وبەردەوام سەیری ئەوان بکەن. کۆمەڵێك هەڵبژێرن کە پێ دەکەنن، وا دیارە کە بەتەواوی ئاگایان لە ئێوەیە. هەر جاری ویەکێك لە ڕستەکان بەوردی بۆیەکێك لەئەو کەسانە باس بکەن، وادابنێن کە لەو ژوورەدا تەنها ئەوانن. دواتر بە ئارامی ولەسەر خۆی چاوتان بۆ لای کەسی سەرنجدەری بەشێکی تر بجوڵێنن ورستەیەك بەشێوەیەکی تەواو وڕاستەوخۆ بۆ ئەویش باس بکەن.

## ڕاستەوخۆ سەیری بیسەران بکەن:

کاتێك ڕاستەوخۆ سەیری کەسێك دەکەن، ئەو کۆمەڵە کەسانەی کە دەکەونە چوار دەوری ئەوانەوە وا هەست دەکەن کە ڕاستەوخۆ سەیری ئەوان دەکەن. کاتێك سەیری ئەو کەسانە دەکەن کە لە دواترەوە دانیشتون، ئەوانەی کە دەکەونە دوای ئەم کۆمەڵەوە ئەمانیشن واهەست دەکەن سەیری ئەوان دەکەن. هەرچی بیسەران زیاتر هەست بەوە بکەن کە ئێوە ڕاستەوخۆ قسەیان لەگەڵدا دەکەن، زیاتر بۆ قسەکانتان گوێ دەگرن و سەرنجتان دەدەن.

## ڕاوەستن و وتاربدەن:

لەکاتی وتاردان بۆ کۆمەڵەیەکی زۆر لە ڕێگەی (( ڕاوەستان وتار بدەن))
سود وەرگرن. لەنێو چوارگۆشەیەکی مەتر بەمەتر یان مەترونیو بە
مەترونیودا ڕاوەستن. هەوڵ بدەن لەبەردوام جولان بۆ پێش ودواو چەپ
وڕاست بە دوور بن. ئەم جولانە لە کۆتایدا دەبێتە هۆی تورەی. بە
زانینی ئەمانە دەتوانن لە پێش وتارداندا کونترۆڵیان بکەن. دەستەکانتان
بە شێوەیەکی ئاسای لە تەنیشتانەوە بن. خۆتان لە یاری کردن بە جل
وبەرگ ودەست کردنە نێو باخەڵ ودرەهێنانی بپارێزن. کاتێک ئاماژە بە
خاڵێك دەکەن دەستەکانتان بۆ سەرەوە بەرز بکەنەوەو ئاماژەی پێ
بکەن دوای ئەوەی کە بە دەستەکانتان ئاماژەتان بە خاڵەکە کرد
دەستەکانتان بهێننەوە دۆخی پێشتری.

### بە شێوەی ئەڵقەی زنجیرێك بۆ بابەتی دواتر بڕۆن:

ئەم ئیشە وەك گێر گۆڕینە و زۆر هاوشێوەن، کاتێك بابەتێك بەتەواوی
ڕوون کرایەوە و بە جوانی باس کرا، دەبێت بە ڕوونی بە بیسەران بڵێن
یان نیشان بدەن کە دەتانەوێت لە بارەی بابەتی دواتر قسە بکەن. لە
کاتی ئەم کارەدا بیسەران واهەست دەکەن کە بابەتی دواتر بەشێکە لە
بابەتی پێشتر. ڕۆشتنی ئێوە بۆ بابەت یان خاڵێکی تر دەتوانن بەم
شێوەیەی لێ بکەن و بڵێن: (( خاڵ یان بابەتێکی تر کە دەمەوێت
ئامـاژەی پێبکەم. . . . . . . )) هەندێ کاتیش من دەڵێم: (( ئێستا
دەمەوێت بە ئێوە بڵێم. . . . . . . . ))
هەر خاڵێك بە شێوەیەکی تەواو باس بکەن پێش ئەوەی بچن بۆ
بابەتێکی تر، ئەنجام و کۆتای ئەو بابەتە باس بکەن. ئەو بابەتەی
کەباستان کردووە ئیتر باسی مەکەنەوە.

## لە سەرەتاوە دەست بەقسەکردن بکەن:

هەندێ کات لە کاتی قسەکردنمدا، نمونەی باش، چیرۆك یان قسەی پێکەنین بە مێشکمدا دێت. ئەمە ئیشێکی ئاساییەو خۆی لە خۆیدایە، ڕێگەیەکی زۆر گونجاو بۆ دروست کردنی پەیوەندی لەگەڵ بیسەراندا. بەوتنی ڕستەیەکی وەك ((بابەتێك بە مێشکمدا هات کەئەم خاڵە بە جوانی ڕوون دەکاتەوە. . . . . . . . )) یا بەوتنی ئەوەی کە (( هەروەك دوێنێ شەو کەسێك لە تەلەفزیۆندا دەیوت. . . . . . . )) بە بابەتەکە ئاماژە بکەن.

مۆڵەت بدەن کە ئەوان بزانن دەتانەوێت لە باسەکە دوور بکەونەوە. بە ئەوان بڵێن: (( مۆڵەت بدەن بۆ چەند خولەکێك لە باسەکە دوور بکەوینەوە. . . . . . . . . . . )) کاتێك چیرۆکەکە تەواو بوو، هەروەك گۆڕینی گێرەکان بۆ باسە سەرەکیەکە بگەڕێنەوە. من هەندێ کات دەڵێم: (( هەفتەی ڕابردوو ڕووداوێك ڕووی داوە کە. . . . . . . ))

هەرچی بڵێن وەهەرچۆنێك کەبڵێن، بیسەرانی ئێوە دەبێت بزانن کە بەسەر باسەکەدا زاڵ بوون و وتارەکەی ئێوە دەستپێك وناوەڕاست وکۆتای و ئەنجامی هەیە.

## بە ئەرکی خۆتانی بزانن کە لەسەر باسەکە قسە بکەن:

وتاردەرانی زۆر هەن کە زۆر بەگوڕن. ئەوان بەباشی و، ڕووخۆشی وقسەزانی قسەدەکەن عادەتەن بە ئاگان وبە ئەزمونن. بەڵام قسەکانیان لەبارەی هەموو شتێکەوەیە. زۆربەی کات زۆربەیان بەباشی دەست پێ دەکەن، بە چیرۆکێکی باش یان بەخاڵێکی گرنگ. دوای ئەوە لە

خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی تر دەڕۆن هەروەك دەڵێن لەم کێوەوە بۆ کێوێکی تر دەڕۆن لە بارەی هەرشتێکەوە کە بیر دەکەنەوە ئەوان قسە دەکەن.
ئەوان زۆربەیان کەسی گاڵتەکەرو، خۆشەویست، سەرگەرم کەرن.
ئامادەبوان پێدەکەنن وستایشی ئەوان دەکەن. بەڵام بیسەران لە کۆتایدا نازانن کە وتاردەر لە بارەی چی بابەتێکەوە قسەی کرد یان مەبەستی لەم قسانە چی بوو. خەڵکی بە نائومێدی هۆڵەکە بەجێ دێڵن، هەروەك کەسێك وایە کە بۆ نانی ئێوارە بانگێشت بکرێت و هیچی پێ نەدەن تەنیا پێش نانێکی سادە نەبێت.

## ئەنجامی بابەتەکە بپارێزن:

بەبۆچوونی دەروون ناسان مرۆڤی بە شەوقی فراوان لە تێگەشتنی زانست وهۆکاری ڕێك وپێکی لە جیهاندا بونی هەیە. ئەم هەستە ((هەستی یەکپارچەیی یان هەستی کۆتای )) ناو دەبرێت کاتێك لە وتارداندا لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی تر دەڕۆن، لە ڕاستیدا ئەم هەستەتان نیشان داوە. لەئەنجامدا، ئامادەبوان لەگەڵ ئێوەدا هەست بە ڕاحەتی وئارامی دەکەن. ئەوان بە شەوق وریایەکی زۆرەوە چاوەڕێی بیستنی بابەتی دواتری ئێوەن.

بە هەمان شێوەی کە لەبەشی ٢دا باسمان کرد، بەم ڕێکخستنە کە لەسەرەتا تا کۆتای وەرقەکە بازنەی گەورە بکێشن بۆ ئەو خاڵە سەرکیانەی کە دەتانەوێت قسەی لەسەر بکەن.
ئەگەر وتاردانی خۆتان خاڵ بەخاڵ باس بکەن، هەروەك بۆقێکە کە لە شوێنیکەوە بۆ شوێنێکی تر باز دەدات. باس کردن بۆ ئێوە ڕاحەتترو ئاسانتر دەبێت بیستنی بابەتەکان بۆ بیسەران بە چێژتر دەبێت.

## وتارەکەی خۆتان ووشە بە ووشە بنوسنەوە:

بەنوسینی یەك بەیەکی ڕستە سەرەکیەکان دڵنیا دەبنەوە کە قسەکانتان زۆرترین کاریگەری لەسەر بیسەران دەبێت. سەرنجی ئەم ڕستەیە بدەن: (( هەر ئیشێك کە بتانەوێت دەتوانن ئەنجامی بدەن. )) هەمان ڕستە بەراورد بکەن لەگەڵ ئەم ڕستەیەدا: (( باوڕەکانت ئیشانێك کەلە داهاتودا جێ بەجێی بکەی سنوردار دەکات )).

## هێزی سێ بەکار بهێنن:

یەکێك لە بەهێزترین هۆکارەکانی وتاردان قسەکردن لە شێوە سێیە. کاتێك ئێوە بابەتێك بە سێ شێواز باس دەکەن، مێشکی مرۆڤ خۆی لە خۆیدا دەکەوێتە ژێر کاریگەریەوە.

بۆ نمونە، لینکلن لە وتاری گتیز برگ، لە دەستەواژەی بەناوبانگ (( لەخەڵکی، لەگەڵ خەڵکی، بۆ خەڵکی )) سودی وەرگرت. وتاری دەستپێکی بەناوبانگی جان ئف کندی، ئەم دەستەواژەی لەخۆ دەگرت: (( هەر بەهایەك قەبوڵ بکەن، تەحەمولی هەر بارێك بکەن، ڕووبەڕووی نارەحەتیەکان ببنەوە. ))

لەبەر ئەمە زۆربەی کات لە وتارەکانمدا دەڵێم: (( ئێوە توانای چارەسەر کردنی هەر کێشەیەکتان هەیە، سەرکەوتن بەسەر هەر کۆسپێکدا وبەدەست هێنانی هەر ئامانجێك کەبۆخۆتان دیاریتان کردووە. )) ئەو ڕستەو دەستەواژانەی کە بڕیارە لە وتارەکەتاندا بیڵێن بە جوانی بیری لێ بکەنەوە، ئەو کاتە بەهێزتر و کاریگەرتو ڕازی کەرتر دەبن.

چەند ساڵ لەمەوبەر، هاورێیەکم هانی منی دا بۆ ئەوەی کتێبێك بنوسم. ئەو ئەو ڕستە باشەی دەستنیشان کرد بۆ ئەوەی هانی من بدات: (( نوسین ئیشێکە کەنابێتە هۆی دواکەوتن ))لەبارەی وتاردانیشدا ئەم بابەتە ڕاستە. تەنها کاتێك کەدەتوانن لە وتاردانەدا باشتر قسە بکەن. لەبەر ئەم هۆکارە کلیلی سەرکەوتن لە وتاردانەدا وەك ئەلبرت هوبارد دەڵێت: (( قسەکردن و قسەکردن و قسەکردن و قسەکردن و قسەکردن و قسەکردن و قسەکردنە )).

## بەدیهێنانی باش لەیەك تێگەشتن لە نێوان بیسەراندا:

هەرچی خەڵکی زیاتر ئێوە خۆشبوێت، زیاتر دەکەونە ژێر کاریگەری ئێوەوە وزیاتر لە ئێوە ڕازین. بەهەمان شێوە کە ویلی لمن کتێبی مردندا دەڵێت: (( باشترین بابەت کوشتنە )).

هیچی شتێك زیاتر لە پێکەنین ناتوانێت بیسەران ببەستێتەوە بە ئێوەوە. هەرچی زیاتر خۆتان لە وتاردان چێژ وەرگرن، ئامادەبوانیش لەگەڵ ئێوەدا زیاتر چێژ وەردەگرن. هەرچی خەڵکی ئێوەیان زیاتر خۆش بوێت، زیاتر گوێ بۆ قسەکانتان دەگرن و بیروبۆچوونەکانتان قەبوڵ دەکەن.

پرسیار یەکێکە لە بەهێزترین شێوەکانی بەستنەوەی بیسەران بە خۆتانەوە. هەرکاتێك پرسیار لە کەسێك بکەن، ئەو ناچیار بە وەڵام دانەوە دەکرێت. تەنانەت ئەگەر ئەو وەڵامی پرسیارەکەش نەزانێت، یان پرسیارەکەی ئێوە بەجدی نەبێت، بەهەرحاڵ وریا دەبێتەوە. ئەو لەمێشکی خۆیدا بەدوای وەڵامی پرسیارەکەدا دەگەڕێت.

بۆنمونە، کاتێك کە دەمەوێت سەرنجی بیسەران بۆلای خۆم ڕابکێشم وبە دەستی بێنم لە شوێنی ئیش وکاردان، هەندێ کات یان جاربەجار دەپرسم: (( گرنگترین وپڕدەرامەترین ئیش لە ئەمریکادا چیییە؟))
پێش هەموشتێك وەلامی ئامادەبوان هیچی شتێك نیە جگە لەبێدەنگی.
دواتر ئەوان هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی وەلامی پرسیارەکە بەدەنگێکی بەرز بدەنەوە: (( نایشکردنی بازرگانی! فرۆشتن! وتاردانی بە ناویانگ! وەرزش!))

کاتێك کە وەڵمی پرسیارەکانم بیست، پێ دەکەنم ودەڵێم:
بەبەهاترین وپڕدەرامەترین کار لە ئەمریکادا، تێفکران یان بیرکردنەوەیە.
وەهەروەها لە نێوان تەواوی ئەوانیشدا کە خەڵکی جێ بەجێی دەکەن، بیرکردنەوە زۆرترین ئەنجامی هەیە. هەرچی زیاتر بیر بکەنەوە، بڕیارانێکی باشتر بەدەست دێنن. بە هۆی بڕیاردانێکی باشتر، دەتوانن ئیشانێکی باشتر بکەن. هەرچی ئیشە جێ بەجێ کراوەکان باشتر بێت، ئەنجامێکی باشترتان دەبێت ڕەوتی پیشەو وژیانتان باشتر دەبێت.
بیرکردنەوە دەست پێ کردن وسەرەتای هەر کارێکە.
دواتر لەبارەی هەندێك لە هۆکارەکان و شێوازەکانی گرنگترین بیرکردنەوە بۆ ئامادەبوان لە پیشەی بازرگانیدا قسە دەکەم. دواتر دەگەڕێمەوە بۆ بیرۆکەکانی ئامادەبوان لە سەر ئەم بابەتە، ئەم شێوە وتاردانە دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی بە تەواوی سەرنجی وتاردانەکەی من بدەن.

## لەگەڵ کاتدا بگونجێن:

باشترین باس کردنی وتاردەرێکی باش بۆ هەر جۆرە وتارێك (( وتووێژ یان گفتوگۆیەکی گەرم وگوڕ))ە.

وادابنێن شۆفێری ئۆتۆمبێلێکی گێڕ تەرحن نەوەك گێڕ ئۆتۆماتیك. ئێوەش لە وتاردانندا لەکاتی گێر گۆڕینن. دەتوانن بەخێرای یان لەسەرخۆی لێبخوڕن یان شۆفێری بکەن. دەتوانن بەدەنگێکی بەرز یان بەدەنگیکی لەسەر خۆی قسەبکەن. دەتوانن دەنگتان بە ئاوازێکی ئارام یان بەگوڕ بێت.

کاتێك هەمیشە لە حاڵی گۆڕانی ئاوازو خێرا وتنی ووشەکانی خۆتان بن، بیسەران بەجۆرێك پەیوەست دەکەن بە وتاردانەکەی خۆتانەوە هەروەك ئەوەی لەکاتێ سەیرکردنی پێشبڕکێی ئۆتۆمبیلدان. لەم بارودۆخەدا بیسەران هەرگیز بێ هەواس وخەوالۆ نابن. هەمیشە لەکاتی گۆڕانی هەندێك لە هۆکارەکانی وتاردانن. لەم بارەیەوە بە شێوەیەکی دوورو درێژ لە بەشی هەشتەم دا قسە دەکەم. بەتایبەتی ئەو کاتانەی کە بەشداربوانی کۆڕەکە زۆر دەبن، لە ئێوەیان دەوێت تا وتاردانێکی کورتتان هەبێت. زۆربەی کات وابڕیارە کە چەند وتاردەرێك لە کۆڕێکدا چەند وتارێك بدەن، لەم کاتەدا ژمارەی ئامادەبوان زۆر دەبێت. لەبەر زۆری وتاردەران کاتی ئەوان زۆر کورت کراوەتەوە وژەندین وتاردانیان لە بەرنامەکەدا گونجاندوە. بۆ نمونە لەم کۆتایانەدا

لە یەکێك لە هاورێکانمیان ویستبوو تا لە کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتیدا کە رێکخرابوو وتار بدات. ئەو ١٢ خولەکی هەبو تا لەبارەی باسەکەی خۆیەوە قسە بکات. رێکخەرانی کۆنگرەکە کاتیان بۆ دیاری کردبوو. بابەتێك کە هەڵی دەبژێرن بۆ وتارەکەی خۆتان پەیوەندی دەبێت

بەوماوە دیاریکراوەی کە بۆیان داناون، واتە نابێت بابەتێك هەڵبژێرن کە زیاتر بەرێت لەو کاتەی کە بۆیان داناون. یاساکەی من ئەمەیە کەئەگەر کاتە دیاریکراوەکەی من ۳۰ خولەك بوو، بنچینەی وتارەکەم لەسەر سێ خاڵی گرنگ دادەنێم. ئەگەر کاتی من نزیکەی یەك کاتژمێر بێت، لە بارەی پێنج خاڵەوە قسە دەکەم. وە ئەگەر کاتی دیاری کراوی من زیاتر بێت واتە ۹۰ خولەك بێت، حەوت خاڵ باس دەکەم. ئەم ڕێ نیشاندانانە سەرمەشقێکن بۆ بنچینەی وتارەکانی ئێوە.

## پوختەو کۆتای پێهێنان:

ئەم بەشە گرنگترین وتاردانی ئێوە ڕێك دەخات. ئەم بەشە زیاتر لەهەموو بابەتەکانی تر لە مێشکی بیسەراندا دەمێنێتەوە دەبێت لە کۆتایدا پوختەی بابەتەکەتان بڵێن. ئێوە دەبێت وەها دەستپێك وپێشەکی خۆتان لەبەربێت تەنانەت ئەگەر لەخەوێکی قوڵیشدا بن بتوانن باسی بکەن.

سادەترین ڕێگایەك بۆ کۆتای وتاردان پوختە کردنی خاڵەکانە لەگەڵ دووبارە کردنەوەی یەك بەیەکی ئەوان و باسکردنیان بەدەست هێنانی ئەنجامی وتارەکەتانە، قسەی کۆتای ئێوە (( بانگهێشت کردن بۆ جێ بەجێ کردنە. )) واتە بە ئامادەبوان دەڵێن ئەو زانیاریانەی کە بۆ ئەوانتان باس کردووە جێ بەجێی بکەن.

گرنگترین بەش ئەوەیە قسەکانی خۆتان بە پوختەیەکی بەهێز کۆتای پێ بهێنن. لە هەندێ کاتدا دەتوانن لە (( یاسای سێ )) سود وەربگرن کۆتاترین داخوازی خۆتان بڵێن. هەندێ کاتیش دەتوانن شعرێك بەکاربهێنن. یان لە هەمان کاتدا دەتوانن لە کۆتایدا قسەیەکی خۆش

بکەن کە پەیوەندی هەبێت بەخاڵە سەرەکیەکەوە لە بەشی یانزیەمدا فێردەبن کە چۆن وتارەکەی خۆتان بە باشی کۆتای پێ بهێنن.

## کاتێك بەکۆتای دەگەن، راوەستن بێ دەنگ بن:

کاتێك وتارەکەی خۆتان تەواو دەکەن، ئیتر قسە مەکەن. پێ بکەنن وبێ بەبێ دەنگی ڕاوەستن.

کاتێك گەنجتر بووم، لە کۆتای وتاردانەکەدا دەم وگوت: (( سوپاسگوزارم ))وە هەروەها بە شوێن ڕیگایەکدا دەگەڕام کە لەسەر شانۆ بڕۆمە خوارەوە. هەندێ کاتیش هێدی هێدی بۆ لای مێزەکە دڕۆشتم وسەرقاڵی کۆ کردنەوەی کەل وپەلەکانم دەبوم. دواتر تێ گەشتم کە ئەم ئیشە دەبێتە هۆی پەشێوی ومەشغوڵ کردنی ئامادەبوان. هەرەها فێر بوم کە وەستان وپێکەنین لە کۆتای وتارداندا، ئەم هەواڵە دەدات کە وتاردانەکە تەواو بوە. لەو کاتەدا ئامادەبوانیش ستایشی ئێوە دەکەن.

## چاوەڕێی بکەن:

چەندین جار، کاتێك بێ دەنگ ڕاوەستاوم، کەسێك دەستی کردووە بە چەپڵە لێدان ودوای ئەو یەکێکی ترو یەکێکی تر. بە زووی تەواوی بەشداربوان دەستیان بە چەپڵە لێدان وستایش کردن کردووە. ئەگەر وتاردەرێکی زۆر باش بن، یەکێك لە ئامادەبوان هەڵدەستێتەوەو بە گەرم وگوڕییەوە چەپڵە لێدەدات و ستایشتان دەکات. دواتریش ئەو کەسانەی کە لە چواردەوریەوەن دەست بەهەمان ئیش دەکەن واتە هەڵدەستنەوە وچەپڵە لێدەدەن. بەم شێوەیە یەك بەیکی ئامادەبوان لە سەر

کورسیەکانیان بۆ ستایش کردن هەڵدەستنەوە. بەڵام ئێوە دەبێت چاوەڕێی ئەمە بکەن.

## وتاردان بۆ بۆنەکان:

هەندێ کات لە ئێوەیان دەوێت بۆ بۆنەیەکی تایبەت وتار بدەن زۆربەی جار کاتتان بۆ خۆئامادەکردن نییە. ئەم بارودۆخە دەتوانێت کاتێکی گرنگ بۆ ژیانی ئێوەو خەڵکانی تر بێت.

ئاسایترین بۆنەکان لە پێنج جۆر پێك دێن ئەوانیش:

١)بەخشینی خەلآت. ٢)ناساندن یان سوپاسگوزاریەکی گشتی. ٣)ڕۆژی لە دایك بوون. ٤)شاییەکان. ٥)کاتی بە خاك سپاردن. لە هەموو جۆرەکاندا سود وەرگرن بۆ ئەوەی وتاردانێکی کاریگەر وبەهێزتان هەبێت.

١) پێشکەش کردنی خەلآت: پێش ئەوەی بچینە سەر شانۆ بیر لەقسەکانی خۆتان بکەنەوە و بیان نوسنەوە. ئەوە بزانن کە بۆچی خەلآتیان پێشکەش دەکەن و بزانن ئەو کەسە لەبەر چیئیشێکیەتی کە شایەنی بەدەست هێنانی ئەم خەلآتەیە.

هەموان لەکاتی سەیرکردنی بەڕێوبردنەکەی ئێوەن ولە قسەکانی ئێوە دەنوسنەوە، بەتایبەت وەرگری خەلآتەکە. هەرچی پێگەی ئێوە لە ڕێکخراوەکەدا گرنگتر بێت. ووشەکانتان زیاتر کاریگەر دەبێت.

هەرکاتێك کەسێك لەبەرامبەر خەڵکی بەتایبەت لەبەرامبەر هاوئاستەکانی یان هاوپۆلەکانیدا بێت دبێتە جێی ستایش کردنیان. بۆنەکە یەکێك لە ڕووداوە گرنگەکان دەبێت. ئەگەر وتاردانێکی یەکدڵی، ژیرانەو بەئاگای لە

بەدەست هێنانی بەهای خەڵاتەکە بێت، دەتوانێت کاریگەری لەسەر ئامادەبوان دروست بکات.

٢) ناساندن یان سوپاسگوزاری: لەوانەیە لە ئێوەیان بوێت کە وتاردەرێک لە ئەنجومەنێك یان کۆنفرانسێکدا بناسێنن. ئەم بەر پرسیاریەتیە بەجدی وەربگرن. هەموان لە کاتی سەیر کردنی ئێوەدان.

لە زۆربەی بۆنەکاندا، کات بۆ ناساندنی وتاردەرەکە دیاری کراوە، خۆناساندن باشتر لە وتاردان دەبێت. زۆربەی بەڕێوبەرە گەورەکان بەرز دەفڕن بەناساندنی بەڕێوبەرێکی گەورە یان وتاردەرێکی باش یەکەمین هەنگاوی خۆیان لە بیر دەکەن.

چەند ساڵێك لەمەوبەر، بانگهێشت کرام بۆ ناساندنی باربارا بۆش، هاوسەر یان خێزانی سەرۆکی وڵات جۆرج بۆش بە ژمارەیەکی زۆری خەڵکی بناسێنم. من بە شێوەیەکی تەواو خۆم ئامادە کردبوو بە شێوەیەك ئەوم ناساند کە کاتێك هاتە سەر شانۆ، هەموو ئامادەبوان لەسەر جێگاکانیان هەستانەوە ستایشی ئەویان کرد وچەپڵەیان بۆلێدەدا. سەرۆکی وڵاتیش سەیری دەکرد، دواتر سوپاسگوزاری منی کرد. من هەرگیز ئەو کاتە لەبیر ناکەم.

لەوانەیە هەموان لەئێوەیان بوێت دوای تەواوبونی وتاردان سوپاسی وتاردەر بکەن. ئەو خاڵە گرنگەی بوەتە جێی باسی وتاردەر بینوسنەوە. کاتێك چوونە سەر شانۆ، بە شێوازێکی گونجاو گرنگترین خاڵەکانی وتاردانی ئەو بە بۆچوونی خۆتان بیڵێنەوە. (( سوپاسی ئێوە دەکەم بە بۆنەی ئەو وتارە باش وکاریگەرەی کە باستان کرد. هەمومان بە گشتی

لە قسەکانی ئێوە چێژمان وەرگرت. من لەو بابەتەی کە پێشتر دەستنیشانتان کردوو ئێستەش باستان کرد زۆر بە سود ببو لام. ))

کاتێك لە بەرامبەر ئامادەبواندا قسەدەکەن. خەڵکی لە مێشکی خۆیاندا وابیر دەکەنەوە کە ئێوە بەئاگاتر وزیرەکترن، قسەزان ترو شایستە تر لە خەڵکین. ئەمە لە دەست مەدەن.

٣) ڕۆژی لەدایك بوون: ئەم بۆنانە بۆ زۆربەی خەڵکی گرنگە. کاتێك لە ئێوەیان دەوێت وتاردانێکی کورت یان بابەتێکی کورت بۆ خەڵکی باس بکەن، بە دڵنیایەوە داواکاریەکانیان جێ بەجێ بکەن. لە پێشدا لەگەڵ کەسی دیاریکراودا قسە بکەن و هەندێك زانیاری لە بارەی ژیانیەوە بپرسن وبزانن. هەوڵ بدەن ڕاستیەکی زانراوی ئەو بزانن بۆ ئەوەی لە وتاردانەکە خۆتاندا سودی لێ وەربگرن وباسی بکەن.

لە کاتی قسە کردندا، بەجەو دەم بەپێکەنین بن. قسەی خۆش بکەن و جۆرێك بکەن کە هەست بە دڵخۆشی خۆیان بکەن یان دڵخۆش بن بە بونی خۆیان. ئەم ئیشە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەموو ئامادەبوان هەست بە دڵخۆشی بکەن لەبارەی خۆیانەوە.

٤) شایی یان زەماوەندەکان:شایی یان زەماوەند یەکێکە لە گەورەترین بۆنەکانی ئەو دوو کەسەو دایك وباوك وخوشك وبرا. ئەو قسانەی کە دەیان کەن وئەو ووشانەی کە بەکاریان دێنن، تا سالآنێك لە بیری خەڵکیدا دەمێننەوە. بۆیە دەبێت بە وردی پلانی بۆ دابرێژن.

چەند ساڵ لەمەو بەربانگهێشت کرام بۆ شای کوڕ وکچێکی دوو خێزانی بەڕێز. ئەوان کرێکار بوون بە موچەیەکی دیاری کراو کاریان دەکرد. ئەوان لە کوڕە ٢٣ ساڵکەیان ویست کە باسێك لە بارەی خوشکەکەیەوە

بکات کە ئەم برای بوکە فیتەر بوو. هەموو میوانەکان لە خۆشی وقسەی پێکەنین کردن وگاڵتە کردن بوون. بەڵام کاتێك کە برای بوك بۆ قسەکردن لەبارەی خوشکەکەیەوە هەستایەوە، هەموان تێگەشتن کە ئەو ئیشەکەی بە قورسی گرتووە. هەر کەدەستی بە قسەکردن لەبارەی خوشکەکەیەوە کرد، هەموان بێدەنگ بون ئەو بۆ ماوە ١٥ خولەك لە بارەی چۆنیەتی گەورە بون وباشی خوشکەکەی قسەی کرد. ئەو گەڕایەوە بۆ سەردەمی منداڵیان ودەستی کرد بە باسکردنی ئەو بەسەرهاتە ناخۆشانەی سەردەمی منداڵیان، دوای ئەوەی کە کۆتا ڕستەی وت وهیوای تەمەن درێژی وژیانێکی خۆشی بۆ خواستن، تەنانەت چاوی یەك کەس نەبو کە وشك بێت هەمویان لەناخی دڵەوە بۆ ئەو نارەحەتیانەی بوکە خان دەگریان.

کاتێك لە ئێوەیان دەوێت کە قسە بکەن، دەبێت هەموو قسەیەك لە کۆڕو مەجلسی خۆیدا بکرێت واتە نابێت لە کۆڕێکدا هەموو قسەیەك بکرێت. بیر لەوە بکەنەوە کە قسەکانتان دەبێت بمێننەوە لە مێشکی بیسەران وئامادەبواندا. لەم کۆڕانەدا دەبێت تەنیا باسی خۆشەویستی نێوان ئەم دووکەسە بکەن. خۆشحاڵی خۆتان دەربڕن و ئومێدی ژیانێکی پڕخۆشەویستی و بەختەوەریان بۆ بخوازن، بڵێن پێیان کە هیوادارم باشترین ژیانتان هەبێت. ووشەکانی ئێوە زۆر گرنگن لە کۆڕەکاندا.

٥) بۆنەی بەخاك سپاردن: لەوانەیە لە ئێوەیان بوێت بۆ هاوڕێیەك یان یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەی خۆتان باسێك بکەن. بە دوو هۆکار دەبێت تەواوی ووشەکانی خۆتان بنوسنەوە. یەکەم لەوانەیە کاتی

قسەکردندا دوو دڵ بن وبترسن. ئەگەر نوسینێکتان نەبێت، لەوانەیە ئەو پلەوپایەیەی خۆتان لە دەست بدەن.

دووەم: ئەگەر نوسیبێتتانەوە، خەڵکی داوا لە ئێوە دەکەن کە ئستنساخێکیان بدەنێ بۆ ئەوەی بۆ هەمیشە لەلای خۆیان هەڵی بگرن.

لەکاتی خوێندنەوەی ووشەکان دەبێت دان بنێن بە یەك بەیەکی ووشەکانداو بە جوانی بیان خوێننەوە. قسەکانتان نابێت لە پێن تا هەشت خولەك زیاتر بێت. لە سەرەتای نامەکەدا بنوسن دڵگرانین بە کۆچی دوای ئەم کەسە باش و ڕاستگۆ وخۆشەویست ودەستپاکە. دواتر لەبارەی خێزانەکەیەوە گرنگی ئەم لای ئەوان وگرنگی ئەوان لای ئەم کورتە باسێك بکەن هەندێك لەبارەی ژیان ودەسکەوتەکانی ئەو بڵێن. دواتر بەخێر هاتنی ئامادەبوان بکەن. قسەکانتان بە ڕستەیەکی نارەحەت ودڵتەنگی بەم شێوەیە ((ئێمە هەرگیز ئەو لە یاد ناکەین وهەمیشە بیری ئەو دەکەین، زۆر دڵتەنگین بەم ڕووداوە )) کۆتای پێ بهێنن.

پێکهێنان وخوێندنەوەی ئەم بابەتە یەکێك لە گرنگترین کارێکە کەبە ئێوە دەدرێت. زۆر بە جوانی خۆتان بۆ ئەم کارە یان ئەم وتاردانە ئامادە بکە.

## پوختە:

قسەکردن لە بەرامبەر ڕادەیەکی بێ ژماری خەڵکی یەکێکە لە باشترین وچاکترین کارێك کە دەتوانن بیکەن. ڕۆژانە هەزاران کەس لە سەران سەری دنیادا بە وتاردانەوە خەریکن. لە بیرتان بێت چۆنیەتی باسکردنی وتارەکە یان چۆنیەتی وتاردان هێندەی ناوەڕۆکی وتارەکە گرنگە. کاتێك توانیتان بە جوانی خۆتان بۆ ئەم شێوە وتاردانە ئامادە بکەن. ئەوا بۆ یەکێك لە کاریگەرترین وڕازیکەرترین وتاردەر دەگۆڕدرێن.

# بەشی هەشتەم

## زاڵبوون بەسەر دەنگدا: ڕێگەکانی هەبوونی دەنگێکی کاریگەر

باشترین وتاردەر ئەوەیە کەفێر دەبێت،

دڵی بیسەر خۆش دەکات ومێشکی دەگۆڕێت.

"سیسرون"

دەنگی ئێوە، گرنگترین هۆکاری ئێوەیە لە کاتی وتارداندا خۆشحاڵانە کاتێك فێری ژەنین یان لێدانی مۆسیقا دەبن. دەتوانن فێر بن کەچۆن لە دەنگتان ڕەزامەندی کۆمەڵ بەدەست بێنن.

هونەرمەندان لەبەر ئەم هۆکارە بەناوبانگن یا ناسراون کە هەموو ڕۆژێ چەند کاتژمێر وهەندێ کاتیش چەندین مانگ یان چەندین ساڵ لەسەر دەنگیان ڕاهێنان دەکەن بۆ ئەوەی دەنگیان بگاتە باشترین ئاست. ئێوەش دەبێت ئەم کارە بکەن. دەنگە بەهێزەکان کاریگەرتر، ئەوان پڕلەهێزو وزەن. کاتێك بە هێزو باوڕبەخۆبونەوە قسەدەکەن، هەروەك ئەو بابەت وخاڵانەی کە باسیان دەکەن باوڕتان پێیانە لەبەرئەوە بیسەرانیش باوڕیان بەو خاڵانەیە کە باسیان دەکەن وقەبوڵیان دەکەن.

### لەسەر خۆ قسە بکەن:

کاتێك هێمنانەتر قسەدەکەن، دەنگتان هێزو پتەویەکی زۆری هەیە. بیسەران سەرنج وگوێ بۆ قسەکانتان دەگرن. باوڕبەخۆبونی خۆتان

نیشانی ئەوان دەدەن. گرنگی ووشەکانی خۆتان زیاد دەکەن. تەواوی کۆمەڵە بەهێزەکان لەسەر خۆ وئاشکرا قسەدەکەن، وەبەباوڕبەخۆبونەوە خۆیان نیشان دەدەن. وتاردانی بەهێز باوڕبەخۆبون کاریگەرتر ودڵ خۆشکەرترە.

بەهەرحاڵ کاتێك بەدەنگێکی زۆر بەرز قسە دەکەن، ئاوازی دەنگتان بەرز دەبێتەوە، زۆربەی دەنگەکەتان منداڵانە بەر گوێ دەکەوێت. لەبەر ئەم هۆکارە کاریگەری قسەکانتان لەسەر بیسەران کەم دەبێتەوە.

## وزە لە پێویستیەکانە:

گرنگترین وتاردان وتاردانێکی پڕ وزەیە. کە وەك وتاردانێکی ((گەرم وگوڕ)) ناسێنراوە کەلە ئاستێکی بەرزی وزەدایە، بۆ ژمارەیەکی زۆری خەڵکی کە لەماوەیەکی دوردا جێ بەجێ دەکرێت.

چەندین ساڵ لەمەو بەر، بۆ ۳۰۰۰ کەس لە هوتێلی ئورلاندو وتارم دەدا. کە وتاردانەکەی من بەشی سەرکی کۆنفرانسەکە بوو چوار ڕۆژی پێدەچیوو. بەهۆی تازەی سیستەمی دەنگی ودڵنیا بون لەهەر دوو میکرۆفۆنەکە پەیوەندییان بەمنەوە کرد ٥٠ خولەك لە قسەکرنم تێپەڕی، هەردوو میکرۆفۆنەکە خراپ بوون. هۆڵکە پڕ بوو لە بەشداربوان. لەبەر ڕوودانی ئەم ڕووداوە ناچیار بوم کە هێندە دەنگم بەرز بکەمەوە کە هەموو ئامادەبوانی ناو کۆڕەکە گوێیان لە دەنگم بێت.

تاڕادەیەك کە توانیم سەرکەوتو بووم. بۆ ماوەی ۹۰ خولەك لەسەر ئەم ئیشە بەردەوام بووم تا دەنگم بەتەواوی لە ناو هۆڵکەدا بڵاو ببێتەوە. دوای وتاردانەکە بەتەواوی ماندو بوبوم. توند قسەکردن بۆ ماوەیەکی

کورتیش ماندوت دەکات چی بکات بەوەی کە بۆ ماوەی ۹۰ خولەك بەدەنگی بەرز قسە بکەیت.

هەواڵی خۆش ئەوە بوو کە وتاردانەکەم پێشوازی لێکراو استنساخی وتارەکەم لە نێوان هەزاران کەسدا بڵاو بویەوە.

## دەنگ دەبێت بەگوێی هەموان بگات:

کاتێك بۆ کۆمەڵێك لەخەڵکی بێ ئەوەی بزانن ژمارەیان چەندە قسەدەکەن. دەبێت دەنگتان بە کۆتا ریزی کۆڕەکە بگات. کاتێك دەنگتان بە کۆتا کەس دەگات، کەواتە سەرنجی ئەو کەسانەش کەلە ناو کۆڕەکەدان بەدەست دێنن.

هەمیشە لە وتارداندا سیستەمی دەنگی باشترین هاوڕێی ئێوەیە. پێش لە وتاردان بەتەواوی کونترۆڵی بکەن یان دڵنیا بن لە خراپ نەبونی. لەناو هۆڵەکەدا بە وردی بگەڕێن بۆ ئەوەی کە بزانن ئایا شوێنێك هەیە کە دەنگی پێ نەگات، ئەگەر هەبوو دەبێت بەزوترین کات چارەسەری بکەن. دڵنیابن لەوەی کەلە هەمو شوێنێکی هۆڵەکەدا سیستەمی دەنگی بە شێوەیەکی باش کار دەکات.

## هیچی شتێك بەبێ کەم وکورتی نابێت:

ماوەیەك لەمەو پێش کۆڕێکی یەك ڕۆژیم بۆ ۸۰۰ کەس لە فیلادلفیا هەبوو. لە ڕابردوودا لە هەمان کۆڕدا وتارم دابوو. لە سیستەمی دەنگی بەتەواوی دڵنیا بوون.

بەڵام پێش لە دەست پێ کردنی وتارەکە، ئەو کەسانەی کە لە دواوەی هۆڵەکەدا دانیشتبون. بەدەستەکانیان ئاماژەیان بۆ دەکردم ناڕازییان دەربڕی لەوەی کە دەنگی من نابیستن. بەهەمان شێوە کەخۆتان بیری لێ

دەکەنەوە، کاتێك کە وتاردەر تێ دەگات کە نیوەی بیسەرانی ناڕەحەت ودڵ تەنگن، ناتوانێت بەباوڕبەخۆ بوون وئارامیەوە درێژە بە بابەتەکەی بدات.

هۆکاری ئەم ڕووداوەش ئەوە بوو کە بەرپرسانی سیستەمی دەنگی لەبیریان چوو بو کە مکەبەرەی ئەو بەشەی هۆڵەکە دابگرسێنن. کێشەکە تەنها ئەوە بو کە بیریان چوبو کە دایبگرسێنن. لە کاتێکدا کە وتاردانەکە دەستی پێ کردبوو، بەرپرسان بۆ بەشێکی تری هوتێلەکە چوبوون. لەبەر ئەوە بوو کە ئەم ڕووداوە ڕوی دا. ماوەی نیو کاتژمێر ئەم کێشەیە درێژەی کێشا تا چارەسەر بوو ئەم ماوەیە دووبارە ناچار بووم بەدەنگی بەرز قسە بکەم.

## سیستەمی دەنگی زۆر پێویستە:

ماوەیەك لەمەو پێش وابڕیار بوو کەلە شوێنێکدا بۆ ١٥٠٠ کەس قسە بکەم لە چەندین ساڵی ڕابردوودا چەندین جار لەم شوێنەدا وتارم داوە بەبێ ئەوەی هیچی کێشەیەك ڕووبدات. ئەم جارەیان بەرپرسانی یان ڕێکخەرانی کۆڕەکە لەبری ئەوەی کە ئەو جێگەیەی کە هەمیشە وتارم تێدا دەداپێم بدەن، هۆڵێکی پێشانگایان پێ دام.

جیاوازی نێوان ئەم دوو هۆڵەیە لەم ناوچەیەدا ئەمە بوو کە هۆڵەکەی پێشوتر فەرشی تێدا ڕاخرابوو سەقفێکی ڕێك وپێك وجوانی هەبوو. هۆڵی پێشانگاکە بە تەواوی پێچەوانەی هۆڵەکەی پێشوتر بوو، بە تەواوی شێواو وناڕێك بوو.

بەم هۆکارە ئەم شێوە ڕێکخستنە کە بۆ مەبەستی پێشانگاکان دروست کرابوو. هۆڵەکە بەهیچی شێوەیەك سیستەمی دەنگی باش یان تەواو

نەبو. دەنگ لە هۆڵەکەدا تـەواو نـەبوو زۆر بەناڕەحـەتی لـە قسـەکان تـێ دەگەشتی یان هەر تێنەدەگەشتی. کاتێك دەستم کرد بە قسەکردن، جگە لەچەند ڕیزێکی پێشـەوە یـان ڕیـزی یەکـەم هیچـی کـەس لەقسـەکانم تـێ نەدەگەشت. هاتوهاوارێك لە نێو بیسەراندا دروست بوو.

هەمویان هەستانەوەو قسەیان بەدەنگی بـەرز دەکـرد. ئـەوان شوێنەکەی خۆیان جێهێلاو بەمەبەستی دەربڕینی ناڕەزای بۆ لای ڕێکخەرانی کۆڕەکـە یـان بەرپرسـانی هۆڵەکـە چـوون لەبـەر ئـەم هۆکـارە هـەموو شـتێك تێـك چوبوو.

## بەبێ سیستەمی دەنگی _ وتاردان ئاڵۆز دەبێت:

خەڵکی بۆ هۆڵ بانگهێشت کران. هـەروەك جـاران بەرپرسـانی هۆڵەکـە لـە بـونی کێشـەیەك لـەم هۆڵـەدا حاشـایان دەکـرد. واتـریش وتیـان ئەگـەر کێشەیەکیش هەبێت بەدەستی ئەوان نیە یـان هیچـی کارێکیـان لەدەست نایەت. ئێمە لە ژورێکـی بـەبێ مکەبـەرەدا گیرمـان خواردبـوو. لەبـەر ئـەم هۆیە ئامادەبوان زۆر دڵگران بـون. ئـەوان ڕۆژێکیـان تایبـەت کردبـوو بـەم کـۆڕەوە خۆیـان لـە ئـیش وکـار کردبـوو تەنانـەت زۆربـەی ئـەوان لـە شوێنانێکی دورەوە هاتبون وخۆیان گەیاندبویە ئەم شوێنەیە.

لەبەر ئەوەی کە ڕازیبونی بیسەران بۆ من گرنگیەکی زۆری هەبوو. بڕیاری بەڕێوبردنم دا دوای ڕێککەوتنێکی خێرا لە نێوان ڕێکخەرانی کۆڕەکەدا، بـۆ دیاریکردنی ڕۆژێکـی تـر کـە هۆڵەکـە هیچـی بۆنەیـەکی تێـدا نـەبێت، بـە بیسەرانم گوت کـە کۆڕەکـە ئـەمڕۆ ڕادەگیرێـت وە بـۆ دوو هەفتـەی دواتـر دوادەخرێت. هەروەها وەك سزایەك بۆ ئەم ڕوودا‌وە کە ڕوویـدا بڕیـار وابـو

کە هەرکەسێك کە پارەی بۆ ئەم بەشداریکردنە داوە، بە شێوەیەکی ویستراوانە کەسێکی تر بێ بەرامبەر لەگەڵ خۆیاندا بهێنن.

هەندێك لەبەشداربوان زۆر بێزار بوون، خۆشبەختانە زۆربەیان فرۆشیارو دامێنەر بوون، وەهەروەها ڕازی بون کە دووهەفتەی تر بێنەوە. جاری دواتر کەهاتنەوە، ئێمە لە هۆڵێکدا بووین، سیستەمی دەنگی زۆر باش بوو، کۆڕەکە بەبێ هەبونی هیچی کیشەیەك بەڕێوە چیوو.

## چاوەڕێی خراپ بونی یان تێکچوونی سیستەمی دەنگی بن:

زۆر ئاساییە کە هوتێلەکان ومەڵبەندەکانی وتاردان لە سیستەمی دەنگی هەرزان بەهاو لە کارکەوتوو سود وەربگرن، لەوە دەچێت زۆربەی هوتێلەکان لەکۆتایی لە کۆتای دروستکردندا ڕووبەڕوی چەندین کێشەی جۆراوجۆری وەك کەمبون یان دابەزینی بودجە ببنەوە. ئەوان بەردەوام بە دوای چەند شوێنێکدا دەگەڕێن کە بتوانن تێچیوونی دامەزراندن یان بنیادنانیان کەم بکاتەوە. ئەو دوو شتەی کە ئەوان دەست نیشانی دەکەن سیستەمی دەنگی و سیستەمی هەواییە. ئەو هوتێل ومەڵبەندانەی وتاردان کە سیستەمی دەنگی وسیستەمی هەوای خراپیان هەیە هێندە زۆرن کە هەمیشە جێی سەرسوڕمانن.

تەقریبەن هەموو ئەو ڕێکخەرانەی کە من ئیشم لەگەڵ کردوون خۆیان هەستاون بە دابین کردنی مکەبەرەو سیستەمی دەنگی. بەو هیوایەن کەئەم ئیشەیان تێچیونێکی کەمیان هەبێت، بەلآم وتاردان لە بەرامبەر ناڕەزای ورقی بەشداربواندا سودێکی نابێت.

## بەهێز کردنی دەنگ:

دەنگی مرۆڤ هاوشێوەی بازوە بەڕاهێنان وود وەرگرتن لێی زیاتر بەهێز دەبێت. زۆربەی ئەوکەسانەی کە دەنگێکی لاوازیان هەبوو، بەڕاهێنان وبەهێز کردنی دەنگی خۆیان، بۆ وتاربێژێکی بەهێزو باوڕبەخۆبوون گۆڕاون.

یەکێك لە باشترین تەکنیکەکان بۆ بەهێز کردنی دەنگی خویندنەوەی شیعرە بەدەنگێکی بەرز. ئەو کۆپلە شیعرەی کە حەزت لێیەتی ولە خوێندنەوەی چێژوەردەگریت دیاری بکەو لەبەری بکە لەکاتی ڕۆشتن وتەنانەت لە کاتی شۆفێری کردنیشدا بەدەنگێکی بەرز بیلێرەوە. لەکاتی خوێندنەوەی شیعرەکەدا وادابنێن کەلە بەرامبەر کۆمەڵێ لەخەڵکیدا وتاردەدەن. بەهەست، هێز، دڵنیایەوە یەك بەیەکی ووشەکان دەربڕن. بەهێمنیەوە بۆ پێشەوە بڕۆن هەروەك ئەوەی کە شیعرێکی تەواو دەخوێننەوە.

ئەو شاعیرەی کە من حەزم لە شیعرەکانیەتی ڕابرت دبلیو سرویسە. شیعرەکانی ئەو بەهێزن هەروەها ئاسانیشن بەئاسانی دەتوانرێت لێی تێبگەیت و زۆر بەئاسانیش دەتوانیت لەبەریان بکەیت، دەتوانیت تاکۆتای تەمەنت بۆ خۆت وخەڵکیشی بلێیتەوە.

ڕیگایەکی تر بۆ بەهێزکردنی دەنگ خوێندنەوەی وتەکانی یەکێك لە ناودارەکانە بەدەنگێکی بەرز وەك شکسپیر. کاتێك کەلە ئامادەییدا بووم، وتاری ئانتونی کەلە بەخاك سپاردنی جولیس سزار کە شکسپیریش لەم بۆنیەدا ئامادە بوو لەبەرم کردو لەبەر خۆمەوە

دەموتەوە. تەنانەت ئێستاش پێش لە وتاردان لەبەر خۆمەوە دەیلێمەوە بۆ ئەوەی هانی خۆم بدەم و وورەی خۆمی پێ بەرز بکەمەوە.

## دەنگی خۆتان تۆماربکەن وگوێی لێ بگرن:

کاتێك شیعر یان وتەیەکی ناودارێك دەخوێننەوە بۆ ئەوەی توانای قسەکردنتان زیاد بێت، دەنگی خۆتان تەسجیل بکەن، چەندین جار بۆدەنگی خۆتان گوێ بگرن وبەدوای چەند رێگایەکدا بگەرێن تا بتوانن ووشەکان بەباشی دەربڕن.

لەکاتێکدا کەسەرقاڵی وانە وتنەوەی وتاردانین بۆ ئەو کەسانەی کە حەزیان لێیە، لەئەوانمان دەوێت کەلە پێشەوەی کۆمەڵەیەکەدا بوەستن وبەشێك لە ژیانی خۆیان بۆ ئەوان باس بکەن. هەندێك لەبارەی پیشەکانیانەوە قسەدەکەن. هەندێك لەبارەی منداڵەکانیانەوە دەڵێن. هەندێکیشیان لەبارەی ئەو ئەزمونە کەلە ژیانیدا وەریان گرتوە قسە دەکەن. ئێمە ئەوان فێردەکەین کەبە بەهێزی وبەدەنگی بەرز قسە بکەن و لە ئاماژەی دەستەکانیان بە جۆرێك سود وەربگرن کە بتوانن زۆرترین کاریگەریان لەسەر بیسەران هەبێت.

ئێمە ئەم وتارە کورتانە تۆمار دەکەین وئەوانیان بۆ بڵاو دەکەینەوە. تەقریبەن لەهەموو بوارەکاندا خوێندکاران سەرسام دەبن. ئەوان سەریان دەسوڕمێ کەچەند بۆ ئەم کۆمەڵە کەم ولاوازە وتاریان داوە.

## وتاردانی گشتی هاوشێوەی وتاردانی ئاساییە نییە:

دیارترین هەڵە کەخەڵکی ئەنجامی دەدەن، وازهێنانە لەسنوری دەنگ، گیرانی زمان یان کێشە وگیر بوونی زمان بەهۆی زۆر بەرز قسەکردنەوە

وبێ دەنگ نەبون یان زۆربێ دەنگ بوون، وەهەروەها وتنی بەردەوام نەگونجاوە.

کاتێك بە فێرخوازان دەوترێت کە بەهێزترو پڕوزە تر بن هەوڵ دەدەن ئەم ئیشانە لەکاتی کۆڕەکەدا تاقی بکەنەوە، بەبینینی تێدەگەن ئیشانێك کەجێ بەجێیان کردوە وبەبۆچوونی ئەوان زۆر بەهێز بووە، تەنیا ئیش کردنێکی سەرەتاو خۆ ویستانە بوە.

## بۆ باش جێ بەجێ کردن دەبێت دووبارەی بکەنەوە:

بەمەبەستی زیادکردنی دەنگی خۆتان لەبەرامبەر ئامادەبواندا، تا ئەو ڕادەیەی کەدەتوانن بەرز قسە بکەن ولەسەر خاڵە گرنگەکان تەقریبەن بەدەنگێکی بەرز قسە بکەن. دەستەکانی خۆتان بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم بابەتە گرنگانە بەتەوای بەرز بکەنەوە دواتر بۆ خوارەوە بیان هێننەوە. ئەم ئامازەی دەستانەتان زۆر کاریگەرن.

هاوسەرەکەم باربارا، لە خێزانێکدا گەورە بووە کە باوکی بەهۆی ئیشی شەوانەوە، کە پاسەوانی قەبرستان بوو، شەوانە بەهۆی ئەو ئیشەیەوە نەیدەتوانی بنوێت هەرلە بەر ئەمەلەڕۆژدا دەنوست. منداڵەکانی ئەو هەمیشە دەبوایە بەبێ دەنگی بمایانەوە یان بە هێواشی قسەیان بکردایە؛ بۆیە تەواوی سەردەمی منداڵی ئەوان بە هێواش قسەکردن تێپەڕی. کاتێك باربارا دەستی کرد بەفێربوون وچۆنیەتی قسەکردن لە بەرامبەر خەڵکیدا، هانی ئەومان دەدا کە بەدەنگی بەرز قسە بکات. کاتێك دەنگی بەرز دەکردەوە، لەو باوڕەدا بوو کە لەکاتی هاوار کردندایە. بەڵام کاتێك کە وتارەکەی تۆمار کراو بلاّو بویەوە. تێگەشت کە ئاستی دەنگ بەرز کردنەوەی کەمێك لە قسەکردنی ئاسای بەرزترە یان زیاترە. ئەو زۆر

سەری سوڕما. ئێوەش ئەگەر وتاردانەکەی خۆتان تۆمار بکەن و دواتر گوێی لێ بگرن سەرتان سوڕ دەمێنیت.

## چاوپێدا خشاندن وسود وەرگرتن:

یەکێك لە باشترین ڕێگاکان بۆ بەرەو پێش چوونێکی خێرا لە وتارداندا دەتوانن جێ بەجێی بکەن. ئەمەیە کە وتاردانەکانی خۆتان تەسویر بکەن وتۆماری بکەن، لەگەڵ کەسێکی شارەزادا سەیری شریتەکە بکەن. لە دوای تێپەڕ بوونی ٣٠ تا ٦٠ چرکە بۆ دواوە بگەڕێنەوە دووبارە ببینەوە. لەبارەی ئەوەی بۆ کاریگەر بون دەبێت باشترە چی بکەن، لەگەڵ یەکتردا قسە بکەن. شریتەکە بوەستێنن وهەڵکان بە شێوەیەك ڕاست بکەنەوە کە ئەگەر کاتی قسەکردن هەبوایە بەو شێوە ڕاستە قسەتان دەکرد.

## ئەوقسانەی کە بە تەلەفون دەیان کەن تەسجیلیان بکەن:

دەتوانن بەتۆمارکردن وبیستنی دەنگی خۆتان سود وەرگرن وبەسەر دەنگتاندا سەرکەوتوو بن. کاتێك بۆ دەنگی خۆتان گوێتان گرت، بە هۆی ئەو هەڵە ڕێزمانیانەی کەلە تەلەفونەکەدا کردوتانە سەرتان سوڕ دەمێنێت. هەواڵی خۆش ئەوەیە کە هەر جارێ کەدەنگی خۆتان تەسجیل دەکەن وگوێی بۆ دەگرن، ئەو هەلانە ڕاست دەکەنەوە کە پێشتر کردووتانە بۆ جاری دواتر دووبارەیان ناکەنەوەو باشتر دەبن.

## بێ دەنگ بوون بۆ کاریگەری:

لەوانەیە بەهێزترین شێواز کە ئێستا فێری بوو بن (( بێ دەنگ بوونە. ))

هەروەها جوانی مۆسیقا بە هۆی بێ دەنگیەتی لە نێوان تۆنەکاندا. لە وتاردانیشدا بێ دەنگ بون لەکاتی تەواوکردنی بابەتێك وچوونی بۆ بابەتێکی ترە، هێزو توانای دەوێت. ئێوە دەتوانن بە ڕاهێنان خۆتان فێری ئەم هونەرە بکەن.

زۆربەی وتاردەران لەکاتی وەستان لە بەرامبەر ئامادەبواندا تورە دەبن ودەشڵەژێن. لەبەر ئەم هۆکارەش خێرا و بە توندی وبەبێ بێ دەنگ بون قسە دەکەن. کاتێك هێمن تر بن بەهێمنی قسەدەکەن، لە شوێن وکاتی خۆیدا بێ دەنگ دەبن وکاریگەریتان لەسەر بیسەران دەبێت. بۆ بەهێز کردنی وتاردانی خۆتان دەتوانن لە چوار جۆر بێ دەنگی سودوەرگرن:

١)بێ دەنگ بونی هەستی. بە شێوەیەکی ڕێك وپێك لەکۆتای ئەو ڕستەو خاڵانەدا کە باسی دەکەن بێ دەنگ بن بۆ ئەوەی ئامادەبوان بتوانن لە زانیارییە نوێیەکان تێ بگەن وبگەنەوە بە ئێوەدا.

مێشکی بیسەران دەتوانێت سێ ڕستە لە یەك کاتدا دەرك پێ بکات وزیاتر لەوە ناتوانن لە مێشکیاندا جێگەی بکەنەوە. لەم بارودۆخەدا مێشکی ئەوان سەرسام دەبێت. مێشکی ئەوان تا کاتێك ئیشێك بۆ بەدەست هێنانی سەرنجیان ئەنجام نەدەن هەر بەهەمان شێوە سەرسام دەبێت.

هیچی شتێك هێندەی بێدەنگی ناتوانێت جێی سەرنج دان بێت. ئێوە ئەوان دەخەنە ناو دوای بێدەنگیەوە کە بۆ ئەوانتان داناوە. بەهەر جارێ بێدەنگی ئەوان ناچیار دەکەن کە سەرنجی ئێوە بدەن.

٢)بێ دەنگی نیشان دان. کاتێك ئێوە دەتانەوێت بابەتێك لە مێشکی بیسەراندا بچەسپێت. لەم جۆرە بێ دەنگیە سود وەربگرن. ئێوە

دەتوانن بۆ تێگەیاندنی پوختەی ئەوەی کە گوتوتانە، ڕاستەوخۆ پێش یان دوای قسەکانتان ئەم جۆرە بێدەنگیە بەکار بهێنن.

٣)بێ دەنگی تەئکیدی یان دڵنیای. بۆ دڵنیا بون لەسەر خاڵێك لەم جۆرە بێدەنگیە سود وەرگرن. بۆ نمونە، زۆربەی کات بە زیرانە دەپرسم:(( ناودارترین کەسی ئامادە بوو لە هۆڵەکەدا کێیە؟ )) کەمێك بێ دەنگ دەبم بۆ ئەوەی ئامادەبوان بەم وەلامەوە سەرقاڵ بن. هەندێ کەس دەڵێن:(( من ))، هەندێکیش دەڵێن: (( تۆ )). دوای هەندێك بێ دەنگی بەردەوامە بە قسەکانم دەدەم وئاماژە بۆ هەموان دەکەم ودەڵێم: (( ڕاستە! ئێوە ناودارترین یان گرنگترین کەسی ناو ئەم هۆڵەن. ))

دواتر بۆ چەند چرکەیەك بێ دەنگ دەبم بۆ ئەوەی لە ڕستەی پێشو تێ بگەن. وە بەردەوامی دەدەم بە قسەکانم:(( ئێوە گرنگترین کەسی دنیای خۆتانن. ئێوە بۆ تەواوی ئەو کەسانە کە لە ژیانتداندا هەن گرنگن، ئەو هەستەی کە هەتانە لە بارەی گرنگی خۆتانەوە دامەزرێنەری ژیانتانە. ))

دواتر باسی گرنگی ڕێز دەکەم. وە بۆ ئەوانی ڕوون دەکەمەوە کە هەر مرۆڤێك بەهەر شێوەیەك بیر بکاتەوە، کاریگەری لەسەر ژیانی خۆی و ژیانی کۆمەڵگاش دەبێت.

٤)بێ دەنگی تەواو بونی ڕستە. لەم بەشەدا ئێوە ڕستە یان گێڕانەوەی وتەی کەسێك کە باس دەکەن هەموان دەیزانن. کاتێك کە نیوەی یەکەمی ئەو وتەیە تەواو دەکەن، بیسەران لە مێشکی خۆیاندا بەشەکەی تری وتەکە تەواو دەکەن. ئەم ئیشەتان دەبێتە هۆی ئەوەی کە بیسەران زیاتر ئاگایان لە وتاردانەکە هەبێت بە وردیەکی زۆرەوە گوێ بۆ قسەکانتان دەگرن.

بۆ نمونـه، مـن لـەم ڕستەیەکی وەهـا سـود وەردەگـرم: ((تـا نارەحـەتی نەکێشی، . . . . . . . . . . . )) دواتر بێ دەنگ دەبم چاوەڕێ دەبم بۆ ئەوەی ئامادەبوان نیوەکەی تری پەندەکە ((شـیرینی ناچـێژی )) تـەواو بکەن. مادام لەم شێوازە سود وەردەگرن، دەبێت بە دڵنیایەوە بێ دەنگ بن وچاوەڕێ بن بۆ ئەوەی ئامادەبوان ڕستەکە تەواو بکەن. دواتر دەبێت خۆشتان ڕستەکە تـەواو و دووبـارە بکەنـەوە. بـەم شـێوەیە بیسـەران بـە تەواوی ئاگایان لە ئێوە دبێت.

## ئاوازی دەنگ:

کاتێـك دەتانـەوێت خـاڵێکی گـرنگ بـاس بکـەن، بـەدەنگێکی بـەرزتر و بـەهێزتر قسـە دەکـەن، کـاتێکیش کـە دەتانـەوێت بابـەتێکی هەسـتیار وسۆزی باس بکەن، بەرزی دەنگی خۆتان کەم بکەنەوە یان لەسـەرخۆ بـە ئاوازێکی خۆشەوە قسە بکەن.

لە وتاردانێکی باشدا هەرچـی زیـاتر لـە شـێوازی دەنگـی جۆراوجـۆر سـود وەرگرن، وتاردانتان بۆ بەشداربوان باشترو سەرنج ڕاکێشتر دەبێت بابەتی وتاردان هەربابەتێك دەبێت کێشە نییە.

## لایەنی فیزیای دەنگ وقورگ:

ئێوە دەنگتان بۆ قسەکردن و ڕازی کردن بە کـاردەهێنن. بـە ئەنجامـدانی زۆربەی ئیشـەکانتان دەتـوانن دڵنیـا بـن لـەو ئەنجامـە باشـەی کـە دەنـگ وقورگت بۆت بەدی دەهێنێت.

وزە بەشێك لەپێویستیەکانی باش قسەکردنە. پێش لەپێش لە وتاردانێکی کورت، دەبێت هەندێك نان بخۆن بۆ ئەوەی مێشکتان هوشیار بێت توانای ئیش کردنی لە باشترین کاتدا بێت.

پێش لە وتاردانێکی درێژتر وەك کۆڕێکی نیوە ڕۆژی یان یەك ڕۆژی، دەبێت بەباشی نان بخۆن.

پرۆتین باشترین وزەیە. بە خواردنی نانی بەیانی یان نانی نیوەڕۆی پرۆتینی دەتوانن بۆ ماوەی ٤ تا ٥ کاتژمێر وزەی پێویستی قسەکردنتان هەبێت. پرۆتین خۆراکی مێشکەو بۆ باش بیرکردنەوەو قسەکردن پێویستتان پێیە. بەخواردنی پرۆتین دەنگتان بەهێز ومیشکتان هوشیار دەبێت.

بۆ دڵنیا بون لە باش بونی دەنگتان، پێش لە وتاردان ئاوێکی مامناوەند بخۆنەوە، چونکە ئەگەر ئاوی سارد بخۆنەوە ئەو ئاوە ساردە وادەکات کە تۆنەکانی دەنگتان تێك دەچێت وهاوسەنگی لە دەست دەدەن.

کاتێك دەبێت کە دەنگتان ڕووبەڕووی کێشە دەبێتەوە. کاتێك قورگ ئێشەتان توش دەبێت، قسەکردن بە دەنگی بەرز زۆر ئاڵۆز دەبێت. لە هەبونی وەها کێشەیەکدا، ئاوی گەرم کەلە نێویدا هەنگوین وئاوی لیمۆی زۆری تێدا کراوە بخۆنەوە. ئەم شێوازە چەندین جار منی سەرسوڕهێنەرانە ڕزگار کردووە.

من ساڵی جارێك بەهۆی گەشتە درێژەکان وپشوە کورتەکان ڕووبەڕووی قورگ ئێشە دەبمەوە. بەلام بەکەم کەم خواردنەوەی ئاوی گەرم کە لەنێویدا هەنگوین وئاوی لیمۆی زۆری تێ کراوە لە درێژەی سیمینارەکەدا، دەنگم بە شێوەیەك نەرم و بەهێز دەکات. من دەتوانم

هەشت كاتژمێری تەواو لە بەیانیەوە تا عەصر، بە بونی قورگ ئێشەوە، قسە بكەم چونكە هەمیشە لە درێژەی سیمیناردا گەرووی خۆم بە جۆرە خواردنەوە چارەسەر دەكەم.

## پوختە:

لە دەنگی خۆتان هەروەك ئامێرێكی مۆسیقا سود وەربگرن. بەرز كردنەوەو دابەزینی ئاستی دەنگتان و دروست كردنی بێ دەنگی، بەرز قسەكردن تارادەیەك بێت كە كۆتاترین ریز بتوانن گوێیان لە دەنگتان بێت، بە ئێوە ئەم هەلە دەدات تا لەهەر بارودۆخێكدا بەهێزەوە قسە بكەن.

بەشی نۆیەم



# فرت وفێڵی بازرگانی: شێوازەکانی مامۆستا وتاربێژەکان

یەکێك لەگەورەترین ڕەزامەندییەکانی تاك لەبەر ئەوەیە کە دەزانێت، دەتوانێت ئیشێك بە باشترین شێوە ئەنجام بدات.

"هرتنس ئادلو"

لەوانەیە ئێستا ۱۰، ۰۰۰ وتاردەری پێشکەوتو یان نیوە پێشکەوتو لە ئەمریکادا هەبن. کە ئیشەکانی خۆیان بەباشترین شێوە ئەنجام دەدەن. لە ۲۰٪ی ئەوان لە ۸۰٪ی پارەکانیان لە پیشەی وتارداندا بەدەست دەهێنن.

واتە موچەی ۲۰۰۰کەس لەم وتاردەرانە چوار هێندەی تەواوی ئەو ۸۰٪یەیە.

۲۰٪ی زیاتر ۲۰٪ی وتاردەرەکان _ واتە ٤٪ی وتاردەرە پێشکەوتوەکان کە نزیکی ٤۰۰ کەس دەبن _ ۸۰٪ی پێدانی مانگانە بۆ بابەتی فێر بوون ووتاربێژی کە بە باشترین واتاردەرەکان دەدەن، دەیکەنە هی خۆیان.

لە ۲۰٪ی زیاتر لە ۲۰٪ی زیاتر لە ۲۰٪ _واتە نزیکەی ۰، ۸٪ی تەواوی وتاردەرەکان کە نزیکەی ۸۰ کەس دەبن _ بۆ یەك وتاردانی ۲۰ خولەکی

٢، ٥٠٠ دۆلار وزیاتریش وەردەگرن. عادەتەن کاتی ئەوان سالآنە پرە لە وتاردان سالآنە مەبلەغێك زیاتر لە ١، ٠٠٠، ٠٠٠ ملیۆن دۆلار داهاتیان هەیە. داهاتی هەندێکیشیان زیاترە لەم برە پارەیە.
مامۆستایانی وتاردانی تەواوکات لەئەمریکادا بەشێوەیەکی ناوەندی کەمتر لە ٥٠٠ دۆلار لە رۆژێکدا داهاتیان هەیە، لەکاتێکدا وتاربێژە پێشکەوتوەکانی هەمان بابەت عادەتەن ٢، ٥٠٠، ٥٠، ٠٠٠ هەتا ١٠٠، ٠٠٠ دۆلار داهاتیان هەیە.
چی جیاوازییەك لە نێوان وتاردەرەکەم دەرامەتەمان وئەوانەش کە موچەیەکی خەیاڵیان هەیە، هەیە؟ من ٢٥ ساڵ توێژینەوەم لەسەر ئەم ئیشە کردووە.

## ئەو وتاردەرانەی کە موچەکانیان لە ئەوانی تر زیاترە:

بۆ دەست پێ کردن دەبێت بڵێین زۆربەی ئەو وتاردەرانەی کەدەسکەوتیان زۆرە (( وتاردەری زۆر گەورەن ))ئەم کەسانە بەهۆی جێ بەجێ کردنی کارێك لە بواری رامیاری، وەرزش یان ئیش وکاردا بەناوباگن. نوسەرانی کتێبە پر فرۆشرینەکانیشیان زۆربەی کات لە ریزی وتاردەرە ناودارەکانن. لانی کەم بۆماوەیەکی کورتیش بێت. زۆربەی وتاردەران زۆربەی کات بۆ وتاردان بۆ رێکخراوەکان وئەنجومەنەکان یان بۆ کۆرە بازرگانیەکان بانگهێشت دەکرێن. ئامانج لەدارێژان یان پێکهێنانی کۆرەکە راکێشانی زۆربەی خەڵکە بۆ کۆر وکۆنگرەکە. هەرچی ئەو وتاردەرەی کە بانگهێشت دەکرێت زیاتر ناودارتر بێت، کەسانی زۆرتر ناودەنوسن وبلیت دەبرن.

## وتاردەرانی بەئەزموون:

دووەمین کۆمەڵە لەوتاردەران بێ گومان بەناوبانگ نین، بەڵام دەسکەوتی باشیان دەبێت. ئەوان وتاری سەرنج ڕاکێش وەهێزوگرنگ بۆ زۆربەی کۆمپانیاو ڕێکخراوەکان وتار دەدەن. لە زۆربەی بوارەکاندا ئەوان پسپۆڕن ولە بواری تایبەتی خۆیاندا سەرکەوتو دەبن وبەوتاردەرێکی بەناوبانگ دەناسرێن.

ئەم کۆمەڵەیە بە مامۆستای وتاردەران ناو دەبەن کەلە بواری ئیش وکار، فرۆشتن، بەڕێوبردن، سەرۆکی، گەشەکردنی تاکی وپیشەی وتاردەدەن کە وتاردەری پێکەنەرن یان قسە خۆشن. بەهۆی ئەوەی کە ئەوان ڕەزامەندی بیسەران بەدەست دێنن. چەندین جار ئەوان بانگهێشت دەکرێن ووتارە باشەکەیان لەناو خەڵکیدا ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەوترێتەوە.

## دووتایبەتمەندی باشترین وتاردەران:

باشترین وتاردەرەکانی هەر شوێنێك، چی ناوداریان چی ئاسایی دووتایبەتمەندییان هەیە.

١) پڕ وزەو بەختەوەرن: ئەوان بەگەرم وگوڕیەوە لەگەڵ بیسەرانی خۆیاندا قسە دەکەن، ئەوان خوێن گەرم خۆشەویست وبەسۆزن. ئەوان بیسەران دڵخۆش دەکەن و وەك هاوڕێیەك لەگەڵ بیسەراندا هەڵس وکەوت دەکەن. لەوەی کە بیسەران بۆچیونەکانی خۆیان لەگەڵیاندا باس دەکەن چێژ وەردەگرن.

٢) وتاردانەکەیان پاراوە: بە هۆکاری ئەوەی کەگوێ گرتن بۆ قسەکانی وتاردەرێك بە شێوەی (( بەرنامەی خۆش _ فێرکاری )) دەبێت، باشترین

وتاردەرەکان باشترین زانیارییەکانی خۆیان لەگەڵ بیسەراندا باس دەکەن. سەرکوتنی وتاردەرەکان تەنیا لەوکاتە درێژەکاندا دەبێت کە وتارەکەیان بەهێزو کاریگەر بێت.

ئامادەبوان دەبێت بە شێوەیەکی دڵخۆشانە وتێگەشتن لێیان هۆڵەکە بەجێ بهێڵن لەبارەی وتارەباشەکەوە لەگەڵ یەکتریدا قسە بکەن. ئەوان دەبێت ئامەزرۆی وتارێکی تری وتاردەرەکە بن.

زۆربەی ئەو کارانەی کە وتاردەرە ناودارەکان بەباشی ئەنجامی دەدەن بەهۆکاری ئەوەی کە ئێوەش دەبێت ئەم ئیشانە بە باشی ئەنجام بدەن. تەنانەت ئەگەر بەنیازی ئەوەش نەبن کە بۆ وتاردەرێکی باش بگۆڕدرێن، بەزانینی ئەوەی کە ئەم وتاردەرانە هانی خەڵکی دەدەن، وە دەتوانن لە سنوری خۆیاندا باشتر ئیش بکەن. لە بەردەوامی بابەتەکدا هەندێك لەیاساکانی ئەوانم هێناوە.

## بەرنامە دارێژەری وتاردانەکە ڕازی بکەن:

لەپیشەی وتارداندا، بابەتی زارەکی تەنها هۆیەکی گرنگ ودامەزراندنی دووبارە بانگهێشت کردن بۆ وتاردان دەبێت. پێش ئەوەی بەرنامەدارێژەرێك بانگهێشتی وتاردەرێك بە پارەیەکی زۆر بکات، دەبێت لەوە دڵنیا بێت کە ئەم وتاردەرە ڕوو خۆشەو کاریگەرییەکی زۆری لەسەر بیسەران دەبێت.

بەهەمان هۆکار، لەپیشەی وتارداندا زۆربەمان دەڵێین ئەرکی وتاردەر ئەمەیە کە ئیشێك بکات کەڕێکخەری وتاردانەکە سەر بەرز بێت، کاتێك بەرنامە دارێژەرەکە وتاردەرێکی باش بانگهێشت دەکات بەشداربوان خۆشحاڵ دەبن، بەشداربوان سوپاسی بەڕێوبەرەکە دەکەن بەهۆی

هەڵبـژاردنی ئـەو وتـاردەرە بـاش وکاریگـەرەوە. لەئەنجامـدا، ئیشـی بەرنامەداڕێژەرەکەجێگـەی سەرسـەوڕمانە وزۆربـەی بەشـداربوان دەسـت خۆشی وخەڵاتیان پێشکەش دەکـەن. بـەهۆی ئـەوەی کـە ئـەم وتـاردەرە کاریگەرییـەکی باشـی هـەبووە جـارێکی تـر ئـەم وتـاردەرە بانگهێشـت دەکرێتەوە.

بۆنمونە، لە منیان دەویست بۆ ئـەوەی لـەکۆرێکی ساڵانەی کۆمپانیایـەك وتار بدەم. جێگری بەڕێوبەر لایەنگری من بوو، بۆ هـەموانی بـاس کردبـوو کە بەتەواوی لەبابەتی وتارەکانم سودی وەرگرتوە. لەبـەر ئەمـە داوای لـە ئەوان کرد کە لە کۆرەکانی دواتریشدا وەك وتاردەرێکی تەواو بانگهێشتی من بکەن. بەڕێوبەرە گەورەکەیان تائەو کاتـەی کـەمنی نـەدیبوو تەنانـەت نـاوی منیشـی نەبیسـتبوو بـۆ کـۆرێکی وەهـا گـرنگ وگـەورە کەسـێکی نەناسراو بانگهێشـت کـراوە، زۆر خۆشـحاڵ نـەبوو. لەگـەڵ ئـەم هـەموەدا جێگیرەکەی ئەوی ڕازی کرد کە هەڵبژاردنی من هەڵبژاردنێکی زۆر ڕاستە.

وتـاردان زۆر بەباشـی پێشـکەش کـرا ئامـادەبوان بەهەسـتانەوە لەسـەر کورسیەکانیان سوپاسـگوزاری مـن بـوون وستایشـی منیـان کـرد. چـەند حەفتـە دواتـر نامەیـەکم پێگەشـت وکردمـەوە کـە جێگـری بەڕێوبـەر لەنامەکـەدا نوسـیبوی کەبەڕێوبەرەکـە بـە شـێوەیەك لـەکۆڕو وتاردانەکـە ڕازی بـووە کـە پلەکـەی بـەرز کردوەتـەوە تـا ئاسـتی بەڕێوبـەری و موچەکەی بۆ ٤٠٠٠ دۆلار زیاد کردووە.

ناوبانگی وتاردەرێك چی باش وچی خراپ، بەخێرای لەنێوان خەڵکیدا بڵاو دەبێتـەوە. یاسـاکە ئەمەیـە: سـەرکەوتنی ئێـوە بـە کۆتـا وتاردانتانـەوە پەیوەندی هەیە. پێش ئەوەی کـە وتـاردەرێکی نـاودار بانگهێشـت بکـەن،

ئەو دەبێت دڵنیا بێت لەوەی کە سەرۆکەکەی و بیسەران لە ئەنجامی ئیشی وتاردانەکە ڕازی و دڵخۆش دەبن.

## بۆدیداری وتاردەرەکانی تر بڕۆن:

تەنانەت ئەگەر ئامانجی ئێوە وتاردان بێت لەناوچەیەی ئیشەکەتان یان لە کۆمەڵگاکەتان، دەبێت بۆ دیداری بۆ دیداری وتاردەرەکانی تر بڕۆن زانیاریان لێوە وەربگرن. ئێوەش دەبێت وەك ئەوان لەتەواوی وتارکان وکۆڕەکاندا بەشداری بکەن. خاڵە گرنگەکان بنوسنەوە. بزانن یا سەرنج بدەن بدەن چۆن پێش کۆڕەکەدا هەڵسوکەوت لەگەڵ بیسەراندا دەکەن وچۆن دەڕۆنە سەر شانۆ، وە چۆن دەست بە وتاردانەکەی خۆیان دەکەن.

کاتێك لە هەر جۆر یان وتاردانێکدا ئامادە دەبن، بەتەواوی هەوڵی خۆتان بدەن تا لەگەڵ وتاردەرە ئامادەبوەکانی کۆڕەکە چاوپێکەوتن بکەن وتەوقەیان لەگەڵدا بکەن، سوپاسی ئەو بکەن بەهۆی ئامادەبونیەوە. بەئەو بڵێن تامەزرۆیانە چاوەڕێی قسەکانی ئەون. ئێوە لەم چاوپێکەوتنە تایبەتیەدا شتێك فێردەبن کە یارمەتی ئێوە دەدات لە وتاردانی خۆتاندا سودی لێ وەردەگرن.

## بۆ خوێندەوە پێداچونەوە وئامادەبون کات دابنێن:

چەند یاسایەك هەیە کەوتاردەرە ناودارەکان و وتاردەرە بەناوبانگەکانی ئیش وکار بۆ بەدەست هێنانی بەرزترین دەسکەوت وباشترین ستایش کردن دەبێت پەیڕەوی ئەو یاسایانە بکەن. یەکەم، بەهەمان شێوە کە چەندین جار دووبارەم کردوەتەوە، وتاردەرە بەناوبانگەکان خۆیان بۆ

تەواوی وتاردانەکان ئامادە دەکەن. ئەگەر وتاردەرێك ۱۰ کاتژمێر لە وەختی خۆی بۆ خوێندنەوە، پێداچونەوە، ڕێکخستن، ڕاهێنان لەسەر وتاردانەکەی خۆی بکات بە یەك کاتژمێر، ئیشێکی غیرە عادی یان خراپی نەکردووە.

وتاردەرە باشەکان تا ئەو شوێنەی کە دەتوانن لەبارەی بیسەرانیانەوە زانیاری بەدەست دێنن. ئەوان لەبارەی تەمەن، وپیشە، و ڕابردووی ئەو کەسانەی کەلە کۆڕەکەدا ئامادە بوون پرسیار دەکەن. ئەوان لەبارەی وتاردەرەکانی پێشو کەبۆ ئەم کەسانە وتاریان داوە وئەو بابەتەی کە بیسەران حەزیان لێبوەو ئەو بابەتەش کە حەزیان لێی نەبووە پرسیار دەکەن. ئەوان دەیانەوێت لەبارەی دەسکەوت وبەرپرسیارەتی ئامادەبوان بزانن.

وتاردەرە بەناوبانگاکان بەدوای ئەو زانیاریانەدا دەگەڕێن کەپەیوەندی بە کۆمپانیاکەوە هەیە وە بەوردی بەدوای ئەو ماڵپەڕەدا دەگەڕێن کەسەر بەم کۆمپانیایەیە بۆ ئەوەی زانیاری باشیان دەسکەوێت. و زیاتر کۆمپانیاکە بناسن.

## لەبارەی ئەنجامەکەی خۆتانەوە بەڕوونی قسە بکەن:

ئێوەش هەروەك وتاردەرێکی بەناوبانگ، لەهەمان جاری یەکەمدا دەتانەوێت بەڕوونی هۆکاری هەڵبژاردنی وتاردەرێك بزانن. لەبیرتان بێت ئامانج ئەمەیە کەدارێژەری بەرنامەکە سەرفراز بێت، وە تەنیا کاتێك کە دەتوانن ببنە هۆی سەرفرازی ئەو کەبەتەواوی بزانن بەرنامەدارێژەرەکە چی لەئێوە دەوێت.

من هەمیشە پێش لە وتاردان دەپرسم کەحەز دەکەن بیسەران دوای تەواو بونی وتارەکەی من چی بڵێن وچی بکەن. کاتێك هەردووکمان بەتەواوی لەیەك تێگەشتین. وتارەکەی خۆم بەشێوەیەك دادەڕێژم کە بەو ئامانجەی هەردووکمان بگەم.

ماوەیەك لەمەو بەر بەڕێوبەری یەکێك لە ڕێکخراوەکان بە منی گوت: ((وتاردانەکەی تۆ باشترین وتاردان بوو کەلەم ١٨ ساڵەدا بیستبێتم. بەهەمان شێوە کە بەڵێنت دابوو، وتاردانەکەت یەك بەیەکی ئەو خاڵانەی تێدا بوو کە پێشتر قسەمان لەسەر کرد وبەباشی پێشکەش کرا. ))

ئەو گوتی: وتاردەرێکی زۆر هەبون کە بەڵێنیان داوە کە وتاردانەکەی خۆیان تایبەت بەم کۆمەڵە کەسەوە بێت، بەڵام ئەم کارەیان نەکرد. یان هەرنەیان توانی وا بکەن. قسەیەك یان بۆچونێك لە نێوان وتاردەراندا هەیە کە (( پەیدا کردنی بیسەری نوێ، سادەتر لەداڕێژان یان پێکهێنانی وتارێکی نوێ دەبێت. )) ئەو کەسانەی کە ئەم نیگەرانیانەیان هەیە، بە ئاسانی هەمان بۆچونە کۆنی خۆیان چەندین جار دووبارە دەکەنەوە لەلایان گرنگ نییە کە بیسەران کێن. ئەڵبەتە ئەوان زۆر لە پیشەیەدا نامێننەوە.

## زمان فێر ببن:

هەر کۆمپانیاو ڕێکخراوێك زمانی تایبەت بە خۆیان هەیە، وتاردەرێکی باش وەها لەگەڵ کۆمپانیاکەدا دەناسرێت کەلە کاتی وتارداندا بیسەران هەست بەوە دەکەن، کەئەم وتاردەرە لە ئیشوکاری کۆمپانیاکەدا سەرقاڵی ئیش کردنە.

## بابەتەكەی خۆتان بەجوانی پێك بهێنن:

وتاردەرە ناودارەكان بابەتی وتاردانەكەی خۆیان لەپێشدا بەجوانی پێكدەهێنن، ئەوان هەمیشە لەكاتی دووبارە نوسینەوەی بابەتەكە خۆیانن وهەندێك لە ڕستەكانیان پێش و پاش دەكەن. ئەوان هەمیشە بەدوای ڕێگەیەكدا دەگەڕێن بۆئەوەی بابەتەكەیان كاریگەرترو بەهێزتر بێت.

## چاوی پێدا بخشێنەوەو ڕاهێنانیان لەسەر بكەن:

وتاردەرە ناودارەكان چەندین جار چاو بەوتارەكەی خۆیاندا دەخشێننەوە وڕاهێنانی لەسەر دەكەن، تەنانەت ئەگەر پێشتریش چەندین جار ئەم بابەتەیان پێشكەش وباس كردبێت. ئەوان هەرگیز بەمێشكی خۆیان یان ئەو زانیاریانەی كە لەبارەی ئەو بابەتەوە دەیزانن بەتەواوی نازانن بەدوای زیاتردا دەگەڕێن. وتاردەران هاوشێوەی فڕۆكەوانان كە پێش لە فڕین چاو بەبابەتی ناو لیستەكەدا دەخشێننەوە. چاو بەیەك بەیەكی ئەو بابەتانەدا دەخشێننەوە كە لە وتاردانەكەدا بوونی هەیە. تاك ئەو كاتەی كە باسەكەیان پێشكەش دەكەن ڕاهێنانی لەسەر دەكەن ودەیلێنەوە.

## شوێنەكە كۆنترۆڵ بكەن:

وتاردەرە ناودارەكان بە زووی دەگەنە شوێنی كۆڕەكەو چاو بە پێداویستیەكانی هۆڵەكەدا دەخشێننەوە بۆ دڵنیا بون لە ئیش كردنیان وخراپ نەبوونیان، هەروەك ڕاهێنەرێك پێش دەست كردن بە یاریەكە

دڵنیا دەبێتەوە لە یاریزانەکان ونەبونی هیچی کێشەیەك لە نێوانیاندا.
ئەوان سەرنجی سێ هۆکاری گرنگ دەدەن کە بریتین لە:
دەنگ، ڕوناکی، پلەی گەرماو سەرما تەقریبەن دەبێت یەکێك لەمانە باش بکرێت وبگۆڕدرێت.
بە بۆچوونی خەڵکی کامێرەکان دەبێت ڕوویکەنە یەك دەم وچاو. لەوتارداندا، لەوتارداندا بەشداربوان تەنیا بۆ یەك هۆکار بۆئەوێ دێن: ئەویش بینینی دەم وچاوشێوەی وتاردەر. ئەوان دەتوانن لەبابەتەکانی تر بەخوێندنەوەی کتێب یان گوێ گرتن بۆ وتارە تۆمار کراوەکان تێ بگەن وزانیاری وەرگرن. شێوەی وتاردەر شوێنێکە یان خاڵێکە کە بیسەران زۆربەی کات سەیری دەکەن وسەرنجی دەدەن.
بەهەمان هۆکار ڕێکخەرانی هەندێك لە هوتێلەکان دەبنە هۆی ئازار وناڕەحەتی بۆ من. بۆنمونە هەندێك لە هوتێلەکان ڕوناکیەکە بە شێوەیەك ڕێك دەخەن کە وتاردەر تەقریبەن لە تاریکیدا دەوەستێت ڕوناکی سەر شانۆ ١٠ تا ١٥ پێ دورترە لە وتاردەرەوە ئەم کارەش وا دەکات کە بیسەران بەجوانی شێوەو دەم وچاوی وتاربێژ بە جوانی نەبینن. کاتێك بەڕیوبەری کۆمپانیا بۆ باس کردنی بابەتێك بۆ سەرشانۆ دەڕوات، ئامادەبوان زۆر بە ئالۆزی دەتوانن شێوە ودەم وچاوی بەڕێوبەر ببینن. زۆربەی خەڵکی گرنگی بەم بابەتە نادەن.

## بیسەران بناسن:

وتاردەرە ناودارەکان پێش لەدەست کردن بە وتاردان بەخێرهاتنی ئامادەبوان دەکەن بۆئەوەی لەگەڵ ئەواندا یەکتر بناسن. ئەوان خۆیان دەناسێنن ولەبیسەران دەپرسن کە پیشەیان چیەیەو وتو وێژێکی کورت

لەگەڵ بیسەراندا دەكەن. لەكاتێكی تردا بیسەران بزانن پێش دەست كردن بەوتاردان هەندێ گفتوگۆ لەگەڵدا هەندێ لە ئەوان دەكەن، بەبۆنەی ئەم ئیشەتانەوە بیسەران بەبینینی ئێوە خۆشحاڵ دەبن وبەشێوەیەكی وردترویاشتر گوێ بۆ قسەكانتان دەگرن.

## ناوی كەسە سەركیەكان بزانن:

یەكێك لەگرنگترین كارێك وتاردەرە پێشكەوتوەكان دەبێت ئەنجامی بدەن، فێربونی ناوی كەسە ناودارەكانی ناو بیسەران وهۆڵەكەیە وناوبردنیانە لەكاتی وتارداندا. هەندێ كات هەندێ قسە بەناوی كەسە ناودارەكانی ناو هۆڵەكەوە دەكەم. بۆ نمونە دەڵێم: (( بەڕێوبەر ئێوە و، ویلیام هنری، هەمیشە جەخت لە چۆنیەتی ئەو كارانەی كەدەیكەن یان ئەو شتانی كە بە كڕیار دەدرێت دەكاتەوە. ))

من ئەم بابەتە لەقسەكانی بەڕێوبەر لەكۆنگرەی ساڵانە، نامە یان ئیمەیلێكم لە ئەو بینیوە وەیا وتاردانێك لەپێش مندا پێشكەش كراوە بیستومەو سودم لێ وەرگرتوە. كاتێك ئێوە لەسەر شانۆ بەشێوەیەكی ئیجابی ئاماژە دەكەن ئەو هەست بەشانازی دەكات.

## بزانن كە چۆن وتاردانەكە دەست پێ دەكەن وچۆنیش كۆتای پێ دێنن:

وتاردەرە ناودارەكان بەشێوەیەكی تەواو وتارەكەی خۆیان پێك هێناوە. لە نێو وتارەكەیاندا بەشێوازێك سەرەتاو كۆتای وتارەكەیان دیاری كردووە. ئەوان بەشێوازیكی جوان دەزانن كە چۆن (( دەست پێ بكەن )) و چۆنیش (( كۆتای ))پێ بهێنن.

## سەرنجی بیسەران ڕابکێشن:

وتاردەرە باشەکان هەر بەهەمان قسەی سەرەتایان سەرنجی بیسەران بەدەست دێنن. لەوانەیە ئەوان بۆ بەدەست هێنان یان ڕاکێشانی سەرنجی بیسەران بێ دەنگ بن یان بابەتێك باس بکەن. من زۆربەی کات کاتێك دەڕۆمە سەر شانۆ، چەند چرکەیەك بێ دەنگ دەبم ودواتر بەگەرم وگوڕییەوە دەڵێم: (( سوپاسی ئێوە دەکەم بەهۆی ئامادەبونتان لە وتارەدا. بەڵێن بەئێوە دەدەم کەلە قسەکانم چێژوەرگرن وسودیان هەبێت بۆتان. ))

ئەم قسەم وەلامێك دەبێت بۆ پرسیارە نەکراوەکەی ئامادەبوان کەلە مێشکی خۆیاندا دەڵێن: (( نازانم ئەم وتاردانە بەسود دەبێت یان نا؟ )) لەهەمان کاتدا بیسەران دڵخۆش دەبن. هەموان پێدەکەنن ولەئارامیدا دەبن. بەم ووشانە وەلامی پرسیاری سەرەکی ئەوان دراوەتەوە.

وتاردەرە ناودارەکان، بیسەران لەسەر جێگەی خۆیاندا دەبەستنەوە. ئەوان بە پرسیار کردن وبێ دەنگ بون وەلام دانەوە وا لەبیسەران دەکەن کەبە جوانی گوێ بگرن. ئەوان بابەتێك باس دەکەن وئامارە بەخالانێك دەکەن کە دڵنیان لێی. بۆ ڕوونکردنەوەی بۆچونەکانیان، سود لەچیرۆکەکان وەردەگرن.

## لەگەڵ ئەواندا وەك هاوڕێ هەڵسوکەوت بکەن:

وتاردەرە باشەکان لەگەڵ بیسەرانیاندا بەشێوەیەك هەڵسوکەوت دەکەن هەروەك ئەوەی هاوڕێ بن. ئەوان پێدەکەنن وخۆشحاڵن لەوەی کە بیسەران هەلێکی وەهایان پێ داون بۆ ئەوەی بۆچون وبابەتەکانی خۆیان باس بکەن. بیسەران زۆر بەزووی هەست بەوە دەکەن کە ئایا

ئێوە ئەوانتان خۆش دەوێت یان نا. ئێوە بەپێکەنینێکی گەرم وگوڕ لەسەرتای قسەکانتانەوە دەتوانن وەڵامی وەها هەستێکی ئەوان بدەنەوە.

## هەموو ڕێگاکانی وتاردان بەکار بهێنن:

وتاردارە ناودارەکان لە کاتی دەست پێ کردنی وتارەکەیان بەڵێن دەدەن کەقسەکانیان بەسودو کاریگەر بێت.

ئەوان عادەتەن چیرۆکێك باس دەکەن کەپەیوەندی بە بابەتەکەیانەوە هەبێت وکاریگەری هەبێت لە گۆڕانی ژیانی بیسەراندا.

وتاردەرەناودارەکان لەهۆکارو ڕێگەکانی وتاردان کە ساڵانێکەلەفیلمەکان بینیویانە یان خۆیان لەسەر شانۆ بەکارییان هێناوە، سود وەردەگرن وبەکاری دێننەوە.

ئەوان بە مەبەستی ڕاکێشانی سەرنجی بیسەران یان بەدەست هێنانی هەلێك بۆ لێکدانەوەی بابەتەکەیان بێ دەنگ دەبن ئەوان پێش لە باسکردنی خاڵەگرنگەکایان ڕاستەوخۆ دوای ئەوە، بێ دەنگ دەبن بۆ ئەوەی لەسەر خاڵکانیان دڵنیا بن یان تەئکید بن. ئەوان بەردەوام پرسیار دەکەن. گوێ گرانیش بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارەکە ناچار دەکرێن. کاتێك کە وتاردەر پرسیارێك لەئامادەبوان دەکات، ئەوان وەڵام دەدەنەوە تەنانەت ئەگەر لەدڵیشیاندا وەڵام بدەنەوە. پەندێك هەیە کە دەڵێت: کەسێك کەپرسیار دەکات کونترۆڵی لەدەست دایە. کاتێك پرسیار دەکەن، تەواوی ئەو کاتەی کە ئەوان بیردەکەنەوە بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکە بدەنەوە، سەرنجی ئەوانتان بۆ لای خۆتان ڕاکێشاوە. مێشکی ئەوان سەرقاڵی پرسیارەکەی ئێوەیە بۆ ئەوەی وەڵامتان

بداتـەوە، بەتایبـەت ئەگـەر پرسـیارەکە بەشـێوەیەك بێـت کـە وەلامـی جۆراوجۆری هەبێت.

## بەردەوام بن لەگۆرینی گێڕەکان:

گـوتن، فرۆشـتن نییـە. بەپرسـیار کـردن دواتـر وەلام دانـەوەی، گێڕێـك بگۆڕن. پێش یان پاش باسکردنی خاڵە گرنگـەکان، بـێ دەنـگ بـن وقسـە مەکـەن. لـەنێوان ڕسـتەکەداو پـێش لەباسـکردنی خـاڵێکی گـرنگ بـۆ ماوەیەکی زۆر بێ دەنگ بن.

وتـاردەرە ناودارەکـان مامۆسـتای ڕێکخسـتنی کـاتن. ئـەوان چـیرۆکێك بەشێوەیەك بـەش بـەش دەکـەن، بـەبێ دەنگـی وبەشـێوەیەکی سـەرنج ڕاکێش باسی دەکەن. هەندێ کات چیرۆکەکە دەبڕن بۆ باسـکردنی خاڵێـك ودوای تـەوابونی خاڵەکـە دووبـارە دەگەڕێنـەوە سـەر چـیرۆکەکە. ئـەوان بابەتەکـەیان بـەم شـێوەیە بـاس دەکـەن. نمونەکـەی ژێـرەوە بـەجوانی مەبەستەکەی من ڕوون دەکاتەوە.

زۆربەی خەڵکی کاتێك ڕووداوێك لـەژێر بەرپرسـیاریەتیەکەیاندا ڕوودەدات سەرسام بێ هۆش دەبن

ئەم بابەتە چیرۆکی (ئـال وسـون)م بەبیر دێنێتەوە کـە سـالأنێك لەمەوبـەر سەر کەشتیەکی باری کەوت بوون کە بۆ سـوید دەگەڕانـەوە. کەشـتیەکە لەباکوری ئـەتلـەتیکدا ڕووبەڕوی بـاو بـارانێکی زۆر بویـەوە. ئـال بـۆلای سـون ڕای دەکـردوو دەیگـوت: (( سـون، سـون، کەشـتی وکەشـتی خەریکە دەشکێت و ژێر ئاو بکەوێت ! )) سـون دەڵێت: ((ئێمە بـۆ دەبێت ناڕەحـەت ونیگـەران بـین؟ ئـەم کەشـتیە ئێمـە خـاوەنی نـین وهـی ئێمـە نییە.))

باشه، کۆمپانیاکەش هەروەك کەشتیەکە دەبێت بۆ ئێوە.

## کات بە ئەوان بدەن تا لەقسەکانتان تێ بگەن:

وتاردەرە ناودارەکان چیرۆکێك باس دەکەن کە هەندێك خاڵی گرنگی تێدا بێت. دواتر چاوەڕێ دەکەن بۆ ئەوەی بەجوانی لەچیرۆکەکە تێ بگەن. ئەوان کات بەخەڵکی دەدەن تا لەخاڵەکانی ناو چیرۆکەکە تێ بگەن ولەگەڵ مێشکیاندا بگونجێت. ئەوان وەك ئامادەبوان سەیر دەکەن بۆ ئەوەی بۆیان ڕوون ببێتەوە کەلە مەبەستی چیرۆکەکە تێ گەشتون.

لەبارەی قسەی پێکەنیناویشەوە بەهەمان شێوە. زۆر گرنگە کاتێك قسەیەکە خۆش یان پێکەنیناوی دەکەن، چاوەڕێ بکەن بۆ ئەوەی هەمویان پێبکەنن ودواتر بێ دەنگ بن. دوای تەواوبونی پێکەنینەکە بەردەوامی بەقسەکانتان بدەن. وتاردەران لەم بارودۆخە چێژ وەردەگرن. ئەوانیش حەز لە پێکەنین دەکەن. ئەوکاتەی کە بیسەران پێویستیانە چی بۆ بیرکردنەوە بێت یان چی بۆ پێکەنین لێیان مەگرن.

## هەم لەدەنگ وهەم لە جەستەی خۆتان سود وەرگرن:

وتاردەرە ناودارەکان هەندێك بە بەرزی قسەدەکەن. ئەم ئیشەیان ئەوە نیشان دەدات کەباوڕیان بە قسەکانی خۆیان هەیە. ئەوان زیاتر لەجەستەیان سود وەردەگرن. بە زۆری دەستەکانیان وشانەکانیان دەجولێنن وزیاتر پێ دەکەنن.

بۆ نمونە، کاتێك دەتانەوێت بابەتێکی گرنگ باس بکەن، دەستەکانی خۆتان بە تەواوی بکەنەوە یا دەنگتان بەرز بکەنەوە. کاتێك دەتانەوێت

یەك دەنگ بن، لەهەمان کاتدا بە نزیکبونەوە لە ئامادەبوان دەستەکانتان لە یەکترییەوە نزیك بکەنەوە.

ئێوە ئەتوانن بۆ دڵنیابون لە خاڵێك سەری پەنجەکانتان بە هێواشی لەمس بکەن. بەبەرز ڕاگرتنی سەر وچۆیەناکەتان ئەو نیشان دەدات کە باوڕتان بە خۆتان هەیە.

پێکەنینێك بۆ ئامادەبوان بکەن. هەروەك بابا نوئێل چاو داگرن. ڕووخۆش بن. بە شێوەیەك قسەبکەن کە چێژ لە کاتەکەتان وەربگرن. ئەم وتاردانە ئەزمونێکی باش دەبێت بۆ ئێوە.

## پوختە:

لە کۆتایدا، تەنیا ڕێگەیەکی فێربونی قسەکردن، قسەکردن و قسەکردن و قسەکردنە. کاتێك ئێوە چەندین جار خۆتان ئامادە کردووە، ڕاهێنا دەکەن وهەوڵ بۆ باشتر کردنی وتارەکەی خۆتان دەدەن، زۆر بەزوی دەبن بە وتاردەرێکی باش و سەرسوڕهێنەر. هەموکەس وکەرتە تایبەتیەکان بانگهێشتان دەکەن و بۆ هەر وتاردانێکیش دەسکەوتێکی باش یان پارەیەکی زۆر وەردەگرن.

بەشی دەیەم



# کۆنترۆڵ کردنی ناوچەی تایبەت بەئێوە

ئێمە ناتوانین ببینە هۆکارێك بۆ بارینی باران، بەلآم دەتوانین ببینە شایەتێك لەبارینی باران بەسەر کێڵگەیەکی ئامادەکراودا.

"هنری نوون"

یەکێك لە کارە سەرەکیەکانی سەرکەوتنی ئێوە وەك وتاردەرێك ئەو هۆڵەیە کەتێیدا وتار دەدەن. ئێوە دەبێت بەجوانی تا ڕادەیەکی باش هۆڵەکە ئامادە بکەن. سێ هۆکاری سەرەکی لە وتارداندا کەدەبێت بەتەواوی ئاگاتان لێ بێت، کە بریتین لەمانە: ۱) دەنگ ۲) ڕوناکی ۳) پلەی گەرما وپلەی سەرما. هەمیشە یەکێك لەمانە لەوتارداندا توشی کێشە یان خراپ بون دەبێت. بەدڵنیایەوە شتێکتان لەسەر یاسای مورفی بیستوە کە یاساکە دەڵێت: هەرستێك بیەوێت خراپ بێت، خراپ دەبێت. لەوە دەچێت ئەم یاسایانە کەسانێك ئاشکرایان کردبێت کەلە هوتێلەکاندا وتاریان داوە یان سیمیناریان تێدا هەبوبێت.

## ئاگاتان لە درۆی خەڵکی بێت:

یەکەمین یاسایەك کەدەبێت لەکاتی باسکردنی هەر وتارێکی ئاساییدا بیزانن ئەمەیە کە بەرپرسانی هوتێلەکان درۆ دەکەن. من لەیەکەمین

وتاردانـدا تـێ گەشـتم لـە ٩٠٪ی ئـەم کێشـانەم بـۆ دووبـارە بوەتـەوە.

بەرپرسانی هوتێلەکان ڕاست گۆنین.

بەبۆچـوونی مـن تـەواوی ئـەو کەسـانەی کـە بەرپرسـن لـە ڕێکخسـتنی کۆنگرەکان، سیمینارەکان و وتاردانەکان، خولێکی تایبەتیان بۆ درۆکردن ونەبردنە سەری بەڵێنەکانیان بینیوە بۆئەوەی لە ڕۆژی پێشکەش کردنی وتارەکەدا ولەکاتی باسکردنیدا لەگەڵ بەرنامـە دارێـژەرانی وتاردانەکـە و لەگەڵ خودی وتاردەرەکەدا درۆ بکەن.

## کونترۆڵ کردنی ئاگر:

یەکێك لە درۆکانی ئـەوان: (( کـونترۆڵ کردنـی ئـاگرە )). ئـەوان هەمیشـە دەڵێن لەبەر ئەگەری کەوتنەوەی ئاگر ناتوانن هیچی ئیشێك ڕاپەڕێنن یان گۆڕانکاری تێدا بکەن. ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئەوان نایانـەوێت کـە هیچی شتێك باش بکەن وگۆڕانکاری تێدا بکەن. پروپاگەندەی ئەوان لـەبارەی (( کۆنترۆڵ کردنی ئاگر)) ەوە هەمیشە درۆیە بەڵام ئەم قسانە دەبێتـە هـۆی ئەوەی کە وتاردەرە تازەکان باوڕیان پێ بکەن.

هەرکاتێك ئەوان ئەم بەهانە بۆ مـن دێننـەوە، بـە ئـەوان دەڵـێم: (( بـاوکی من کارمەندی ئاگرکوژێنەوەیە، بە تەواوی شارەزایم لـەم بارەیـەوە هەیە. بـەمن بڵـێن کـام یـەك لەیاسـاکانی کـونترۆڵ کردنـی ئـاگر دەڵـێن کـە دامەزرانـدنی هۆڵەکـە ناتوانێـت بـەو شـێوەیە بێـت. )) ئـەم قسـەی مـن هەمیشـە ئـەوان سەرسـام دەکـات وئـەوانیش ڕاسـتەوخۆ دەسـت بەهێنانەوەی بیانو دەکەن، مـن چـەندین جـار دووچـیاری ئـەم کێشـەیە بووم.

بەهۆی کۆمپیوتەرەوە کونترۆڵ دەکرێت:

یەکێك لەبیانوەکانی تری ئەوان کەلەوانەیە ڕووبەڕووی ببنەوە، ئەمەیە:
(( کارو ڕەوتی ڕێکخستنی ڕووناکی هۆڵەکە بە کۆمپیوتەر کۆنترۆڵ دەبێت. تاکاتێك موهەندیسی تایبەت بەم کارە نەیەت، ئێمە ناتوانین هیچی شتێك بکەین. ))

## چۆن هەڵسوکەوت بکەین لەگەڵ ئەو درۆیانەی کە خەڵکی دەیکەن:

بۆ ئەوەی کێشەی ناو ژوو، کۆنفرانسەکە چارەسەر بکەین، دەبێت بە دڵنەرمانەومونەدەبانە و یەك دلآنە، لەسەر داواکاریەکانتان پێدا گری بکەن. ئامانجی ئێوە ئەوەیە کە فێرخوازان لە مەرحەلەی یەکەمدا لە ئێوە توڕە نەبن. ئەوان تەنها کەسانێکن کە دەتوانن هاوکاری ئێوە بکەن. بەم شێوەیە بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانتان دەتوانن بابەتەکانی خوارەوە جێ بەجێ بکەن.

### لەکاتی پێویستدا ئاگاداریان بکەنەوە:

جارێکیان سیمینارێکم لە شاری تامپای فلۆریدا هەبو. گەرمی ژورەکە ٨٠ پلەی فەرەنەهایت بوو. بەهۆی گەرمیەوە ئامادەبوان ئارەقیان کردبوو. وەك باوەشێنێك کاقەز و وەرەقەکانی خۆیان بەکاردەهێنا، بەتەواوی نارەزای وناڕەحەت بوون. ئەوان کەم کەم دەستیان کرد بەڕۆشتن وجێ هێلآنی هۆڵەکە. من داوام لەبرپرسانی کۆنفرانسەکە کرد وگوتم تەلەفون بکەن بۆ هوتێلەکە بۆ ئەوە ئامێرێکی فێنك کەرەوە دابگرسێنن تا پلەی گەرمی هۆڵەکە کەم ببێتەوە. ئەو چەندین جار تەلەفونی کرد بەلآم

نەیتوانی کەس بدۆزێتەوە. ئەوان هەروەك جاران بەهانەیان دەهێنایەوە ودەیانگوت: (( سەرقاڵی چارەسەر کردنی ئەو کێشەیەن. دابەزینی پلەی گەرمی بە کۆمپیوتەر کۆنترۆڵ دەکرێت وئێمە هەر ئیشێکمان لەدەست بێت ئەنجامی دەدەین. ))

لەئەنجامدا، لەکاتی پشوداندا، من تەلەفونم بۆ بەڕێوبەری هۆڵەکە کردو گوتم ئەگەر تا دوو خولەکی تر ئامێری فێنك کەرەوە ئیش پێ نەکرێت، سیمینارەکە هەڵدەوەشێنمەوە. پارەی گرتنی هۆڵەکەش نادەین وسەرەڕای ئەوەش شکات دەکەین. زۆر باش بوو. دوای ئەوەی کە چومە سەر شانۆ، هەستم بە هەوایەکی فێنك دەکرد کە دەهات. ئامێری فێنك کەرەوە کەیان داگیرساندو تاکۆتای ئیشی دەکرد. دوای دووسەعات گوێ گرتن لێیان کەبەهانەیان دەهێنایەوە بۆ ئەوەی پارەکەیان پێ بدەین، چونکە ئێمە ئاگادارمان کردبوونەوە کە پارەیان پێ نادەین.

## لە پێ دانی پارە پەلە مەکەن:

من هەمیشە بەهاوکارانم دەڵێم کاتێك کە دەتانەوێت هۆڵێك بگرن لەگەڵ بەرپرسانی هۆڵەکەدا قسە بکەن وبڵێن: (( ئێمە تائەو کاتەی کە ئامێری فێنك کەرەوەو گەرم کەرەوە بە باشی ئیش نەکەن، پارە نادەین. )) تەقریبەن بە قسەکردن لەگەڵیاندا دەتوانین کێشەکان کەم بکەینەوە. بەم شێوەیەش پلەی گەرما ئاسای دەبێتەوە.

## ڕوناکی کۆنترۆڵ بکەن:

ڕوناکی هۆکارێکی گرنگە لەسیمینارەکاندا. تەواوی سەرنجی ئامادەبوان دەبێت لەسەر شێوە ودەم وچاوی ئێوە بێت. لەبیرتان بێت لە٧٠٪ی

ئامادەبوان ((بینەری تەوەرەكەن. )) ئەوان تەنیا كاتێك دەتوانن زانیاری وەرگـرن كـە وتاردەرەكـە ببیـنن. ٣٠٪ی كەماوەتـەوە (( بیسـەری تەوەرەكەن. )) ئەم كەسانەش تەنیا كاتێك كەدەتوانن زانیاری لە ئێوە وەرگرن بە ڕونی قسەكانتان ببیستن. ئەركی ئێوە دروست كردنی هەر دوو بارودۆخەكە وبەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەم دوو كۆمەڵەیە.

٥٠٪ی كێشەكە كاتێكە كە دەتانەوێت دەست بە وتاردان بكەن، ئەو كاتە تێ دەگەن كە ڕوناكی كێشەی هەیە ولەئاستی پێویستدا نییە. بۆ ئەوەی توشی ئەم كێشەیە نەبن. دەبێت ماوەیەك پێش لە وتاردان بڕۆن بۆ هۆڵەكەو ئەم كێشانە چارەسەر بكەن. زۆربەی كات ئەگەر كێشەش لە ڕوناكیدا هەبێت ناتوانن چارەسەری بكەن چونكە ئێوە لە وتارداندان.

## گلۆپەكان دەبێت لەكوێدا بن:

پێشـكەش كـاری تەلەفزیۆنـەكان یـەك یـان دوو ڕۆژ لەسـەر سیسـتەمی دەنگی ئیش دەكەن. ئەوان بۆ ئەوەی هیچی سێبەر وتاریكیەك نەكەوێتە سـەر شـانۆ چـەندین جـار گلۆپـەكان لـە شـوێنێكەوە بـۆ شـوێنێكی تـر دەگوازنـەوە. ڕوناكیەكـە دەبێـت بەشـێوەیەك بێـت ئامـادەبوان لەهـەر شـوێنێكدا بـن بـەڕوونی كەسـی سـەر شـانۆ یـان وتـاردەر ببیـنن. ئەمـە گرنگترین حاڵەتە.

كاتێك وتار دەدەن دەبێت ڕوناكی بە شێوەیەكی باش لەسەر ئێوە بێت وهیچی سێبەرێك نەكەوێتە سـەر شێوەو دەم وچاوی ئێوە. زۆر ئاساییە كە ڕوناكی لەسەر شانۆ بێت لەبری ئـەوەی كەلـە بەرامبـەرتان بێـت، واتـە ڕوناكیەكە لەسەر سەرتانەوە بێت بەڵام ئەم ڕێگەیە سەركەوتو نییە لەبەر ئەوەی نیوەی دەم وچاوتان ڕونـاكی دەكەوێتـە سـەر ونیوەكـەی تریشـی

سێبەر وتاریکە. ئەم هۆکارەش نارەزای لەنێوان بیسەراندا دروست دەکات.

تارمای ئۆپێرا:

لەیەکێك لەبۆنەکاندا کەوتاردانم هەبوو، داوا م کرد کەچەندین بلاجیکتۆرم بۆ بێنن بەلاّم هەر وەك جاران بەردەوام بوون لە درۆکردن وبەهانەهێنانەوە. بەئێمەیات گوت تەنیا یەك بلاجیکتۆر دەتوانن بۆ ئێمە بێنن. بەرێوبەرانی ئەم هۆڵە بلاجیکتۆرێکیان هێناو لە سوچێکدا دایان نا. ڕوناکی ئەم بلاجیکتۆرە لەنیوەی دەم وچاوی منی دەدا کە وەك تارمایی ئۆپێرا وابوو.

نارەزای وبەرهەڵستی بیسەرا ڕوولەزیادبونی دەکرد، بەتەواوی تورە بووبون پەشیمان بوون لەوەی کە پارە بدەن. بیسەران لە هۆڵەکەدا چوونە دەرەوە. لەبەر ئەوەی کە دەم وچاوی من نیوەی تاریك بوو، وەك شتێکی ترسێنەرم لێهاتبوو. زۆر تورەو ناڕازی بون. ئێمە هەرگیز ئەم هەڵەمان دووبارە نەکردەوە.

## شێوەو دەم وچاوی ئێوە زۆر گرنگە:

هەرکاتێك خەریکی ڕێکخستنی ڕوناکی هۆڵەکەم، بەبەرپرسە تایبەتەکەی ئەم کارە دەڵێم دەبێت بەشێوەیەك ئەم هۆڵە ڕوناك بێت کەرێزی دواوە بەجوانی دەم وچاوی من ببینن. من زۆر سورم لەسەر ئەم خاڵە کەدەبێت ڕوناکی سەر شانۆ بەشێوەیەکی تەواو ڕێکبخرێت. ئەوان وەك ڕەزامەندیەك سەریان دەجوڵێنن لەسەر قسەکەی ئێوە یەك دەنگ

وهاوڕێان. هەندێ کات ئەوان وابیردەکەنەوە کەئێوە نازانن لەسەر چی بابەتێك قسەدەکەن. لەبەر ئەمە دەبێت لەسەر قسەکەی خۆتان سور بن.
لەزۆربەی کاتەکاندا، بەرپرسانی ڕوناکی دەڵێن: (( ئەگەر ئێمە هەمو گڵۆپەکان دابگرسێنین، ئەوا پەردەکە نابینرێت. )) دەبێت ئاگاتان لەم قسەیە بێت. بەدڵنیایەوە پێیان بڵێن کە بینی پەردە گرنگیەکی وەهای نیە. بەڵکو گرنگترین شت ئەوەیە کەڕوناکی لەسەر شێوەو دەم وچاوی ئێوە بێت.

## لەپێشدا هەمو شتەکان ڕێك وتەواو بکەن:

چەند ساڵ لەمەوبەر کۆڕێکم لە ئێروینی کالیفۆرنیادا. سیمینارەکەی من دوای نیوەڕۆ بوو وەك جاران بەیانی بۆ شوێنی وتاردانەکە چووم توانیم بەباشی وتاردانەکانی پێشو ببینم.
کاتێك ڕۆشتمە ناو هۆڵەکەوە، تێگەشتم کەهۆڵەکە وەك یانەیەکی شەوانەیە کەبە تەواوی ڕوناك نییە. دەم وچاوی وتاردەران بەتەواوی دەرنەدەکەوتو وناڕون بوو. زۆر سەرم سوڕماو هەستم بەبێزاری دەکرد.
دواتر یەکێك لەبەرپرسەکانم بۆ ناوهۆڵکە هێناو بەوم گوت: (( دەتوانیت بەهەر شێوازێك بێت ڕوناکی ناوهۆڵەکە زیاد بکەیت. )) ئەو وەڵامی دایەوە وگوتی: (( ئۆو واتە تۆ دەتەوێت هەموو گڵۆپەکان دابگرسێنم؟ ))
کاتێك گوتم بەڵێ. ئەو بێ ئاگایانە بۆلای دیوارەکە چوو کەپلاکی گڵۆپەکانی پێوە بوو چەندین گڵۆپی داگیرساندو تەواوی هۆڵەکە وەك پۆلێکی دەرس خوێندن ڕوناك بویەوە. بە ڕوناك بونی هۆڵەکە بەلای ئامادەبوانەوە سەرسوڕهێنەر بوو. ئەوان ئەو دوو کاتژمێرەی کە مابویەوە. بەتەواوی توانیان وتاردانەکە ببینن وبە جوانی لێی تێبگەن.

## وتاردان بەرنامەیەك بۆ یانەی شەوانە نییە:

من پشت بەم ڕستەیە دەبەستم. هەرکاتێك لەگەڵ بەرپرسان لەبارەی هۆڵەکەوە قسەدەکەم بەئەوان دەڵێم کە دەبێت هەموو گڵۆپەکانی ناو هۆڵەکە ئیش بکات، (( ئەمە بەرنامەیەك نیە بۆ یانەی شەوان )) کە بەتەواوی ڕوناك نەبێت.

من سەرم لەم خاڵە سوڕ دەمێنێت کە زۆربەی وەستاکانی بلاجیکتۆر وابیردەکەنەوە کە وتاردەر حەز دەکات کە ئامادەبوان لەناوچەیەی تاریکیدا دابنیشن، لە کاتێکدا بەهۆی ئەوەی کە ڕوناکیەکی زۆر لەناوچاوانی دەدات ناتوانێت ئامادەبوان بەباشی ببینێت. کێشەیەکی تر لەم بارەیەوە ئەوەیە کەئامادەبوان وەك کەسێکی سەرقاڵ کەر سەیری ئێوە دەکەن. ئامادەبوان بەبێ دەنگی دادەنیشن وچاوەڕێی دەست پێ کردنی وتارن وهیچی دەنگێکیان لێوە نایەت. ئەوان وەڵامی پرسیارەکانی وتاردەر نادەنەوە ولەگەڵ وتاردەردا نین. ئامادەبوان وەك مشکی کوێریان لێ دێت. کە بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو کونەکەی خۆیان لە ڕێڕەوێکدا هەڵکەندوە کە وتاردەر لەبەردەمیاندا وەستاوە و ئەوانیش سەر لەکونەکەیان دەردێنن.

لەبیرتان بێت کە ئێوە دەبێت بتانەوێت (( چەندین گڵۆپ لەتەواوی هۆڵەکەدا دابگرسێنن )) مەگەر ئەوەی کە یاریزانێکی یانەی شەوانە بن.

واتە تەواوی هۆڵەکە دەبێت بەشێوەیەکی یەکسان ڕوناك بێت وەك پۆلێکی دەرس خوێندن. ئێوە دەتانەوێت ئامادەبوان بتوانن ئێوە وئەوانی تریش ببینن، لەقسەکانی ئێوە بنوسنەوە. ئەم ڕێگەیە دەبێتە هۆی دڵخۆشی وڕەزامەندی ئامادەبوان.

## دەبێت ڕێکخستنی هۆڵەکە ڕێك بخەن:

بەڵەوکەسانەی کە مێزو کورسیەکان دادەنێن وڕێکیان دەکەن بڕێکی کەم پارە دەدەن. هەندێ لەئەوان گوێ بەوخاڵانە نادەن کەلەسەری ڕێك کەوتون لەگەڵ بەرپرسانی هۆڵەکەدا. ئامانجی ئەوان ئەوەیە کەلەناو هۆڵەکەدا خێرا کورسیەکان دابنێن وپێش ئەوەی کەسێك بێت ورەخنە لەچۆنیەتی دانانی کورسی ومێزەکان بگرێت، خێرا دەچنە دەرەوە.

## پێشنیار لەسەر دانانی کورسیەکان بکەن:

لەکاتێکدا کەخەریکی ڕێکخستنی وتاردان لەسەرانسەری ولاتدا بوم، لە ئێمەیان ویست کەلە کاتی دانانی کورسیەکاندا ئامادە بین. ئێمە دەمانزانی کەلەوانەیە سەدان هەڵە ڕووبدات دەمانویست تاکاتێك کە خزمەتکاران لە بەردەستدان ونەڕۆشتون، لە ئەوانمان بوێت کە گۆڕانکاریەکی پێویست دروست بکەن. چەندین جار بەئێمەیان گوتوە کە شەوپێش لە وتاردانەکەی ئێمە خزمەتکاران کاتژمێر ٣ی بەیانی بۆ ئیش کردن وڕێکخستنی مێزوکورسەکان لەوێ دەبن. ئێمەش دەمان گوت: (( زۆر باشە، ئێمەش کاتژمێر ٣ لەوێ دەبین. )) چەندین جار ڕوویداوە کە ئێمە کاتژمێر ٣ گەشتوین بینیومانە کە کورسیەکان بەشێوەیەکی ناڕێك دانراون وکرێکارەکان ڕۆشتونەتەوە. دۆزینەوەو کۆکردنەوەی تەواوی کرێکاران وڕێکخستنی کورسیەکان بەو شێوەیەی کە ئێمە دەمانەوێت ئیشێکی زۆر قورس ودژوار دەبێت بۆمان. هیچی کات ئەم بەشە گرنگەی ئیشەکەتان بەئاسای وسادەی مەگرن. دەبێت گرنگی پێبدەن.

## هیچی شتێك بەبێ نرخ دامەنێن:

هـەتا كاتێـك ئێـوە بەشـێوەیەكی تـەواو ڕونـی دەكەنـەوە كەڕێكخسـتنی هۆڵەكە دەبێت چۆن بێـت. هەنـدێك كرێكارەكـان لەوانەیـە بـە شـێوەیەكی تەواو لەبۆچـیبون ومەبەسـتەكانی ئێـوە تـێ نەگـەن. گرنگـی ئامـادەبونی ئێـوە پـێش لـەوتاردان بەمەبەسـتی كـونترۆڵ كردنـی هـەوو شـتێك پـێش لەوتاردان لێرەدا ئاشكرا دەبێت.

بەشێك لەسەركەوتنی من وەك وتاردەرێـك لـە درێـژای ئـەم سـالآنەدا، دوو دڵیمـــە لـــەبارەی ڕاحـــەتی ئامـــادەبوان وبیســـەرانەوە. لەیەكـــەمین كۆنفرانسمەوە كەنزیكـەی ٧كـەس بـوون، هـەولم دەدا كـە ئامـادەبوان بـە ئاسانی من وئەو زانیاریانەی كەلە سەر تەختەكە دەینوسم بتـوانن ببیـنن. من لەكاتی ڕێكخستن ودانانی مێز وكورسیەكاندا ئامـادە بـووم بـۆ ئـەوەی دڵنیا بم كەئامادەبوان لەسەر كورسیەكاندا بەئاسانی بتوانن ببینن.

بـەزۆر بـونی ژمـارەی بیسەرانیشـم، هەمیشـە هـەوڵی ئـەوەم دەدا كـە بیسەران ئاسودە بن. لەڕاستیدا لـەماوەی ئـەم چـەند سـاڵەدا بـۆ هـەزاران كەس وتـارم داوە هەمیشـە هـەولم داوە بـۆ ئـەوەی بیسـەران ئاسـودەبن، ئەگەر هەوڵەكەشم بۆ شتێكی بچووك بووبێت.

## هەموان دەبێت بەئاسانی ئێوە ببینن:

هـەموو ئامـادەبوان دەبێـت لـەو شـوێنەی كەتێیـدا دانیشـتون بتـوانن بەئاسـانی ئێـوە ببیـنن. بـەم واتایـە، دەبێـت كورسـیەكان بەشـێوەی نیوبازنەی دابنرێت وڕێكبخرێن، ئەگـەر ژمـارەی بیسـەران زۆر زیـاد بێـت، هەموو كورسیەكان دەبێت لەگۆشەی ٤٥دا دابنرێن وڕێكبخرێن، بۆ ئـەوەی

ئەو کەسانەی کەلە کۆتاییەوەن، بەبێ هەستانەوە یان چەمانەوە وتاردەرەکە بە ئاسانی ببینن.

دەبێت لەیەکەم ڕیزەوە هێندە نزیک بن کە بەچەمانەوەتان بتوانن دەس لەئەوان بدەن یان تەوقەیان لەگەڵدا بکەن، هەرچی ڕیزی پێشەوە دورترین، بۆ پەیوەندی دروست کردن لەگەڵ ئەواند پێویستتان بە وزەی زیاتر دەبێت.

## ئامادەبوان لەنزیک یەکدا دابنیشێنن:

وادابنێین کە وزەی ئێوە وەک وزەی کارەبایە. ئێوە دەتانەوێت وێستگەیەکی کارەبا دروست بکەن پەیوەندی عاتفی لەگەڵ ئامادەبواندا. هەرچی ڕیزی یەکەم زیاتر نزیک بن. دروست کردنی پەیوەندی وزەی کارەبا ئاسانترەو بەم شێوەیە ئاسانتر دەگوازرێتەوە وئەم باسە بەئاسانی دەگاتە گوێی ئەوان.

کاتێك لەنێوان ئێوە وڕیزی یەکەمدا مەودایەکی زۆر هەبێت، وزەی ئێوە بە ناڕەحەتیەکی زۆر دەگاتە ڕیزی یەکەم. بەلام کاتێك ڕیزەکانی پێشەوە زۆر نزیکبن لێتانەوە، وزەی ئێوە بەئاسانی دەگاتە ڕیزی یەکەم وەك شەپۆل لە ڕیزێکەو بۆ ڕیزێکی تر دەڕوات تا دەگوازرێتەوە یان دەگاتە ڕیزی کۆتای. ڕێك وەك شەپۆلێکی بچووك کەلە ئاودا دروستی دەکەن دواتر دەگۆڕێت بۆ شەپۆلێکی گەورە ولەناو ئاوەکەدا بلاو دەبێتەوە.

## ڕێنموییان بکەن بۆ پێشەوە:

هەندێك لەبەرپرسە ڕێکخەرەکان وابیر دەکەنەوە کەئەگەر مێز وکورسیەکان بەشێوەیەکی بلاو لەهۆڵەکەدا دابنێین، وا هەست دەکەن بەم

شێوەیە بەهایەکی زۆر بۆ هۆڵەکە دادەنێن. ئەم بیرۆکەیە ڕاست نییە. خەڵکی گرنگی بە پشتەوەیان نادەن. ئەوان تەنها گرنگی بە مەودای نێوان خۆیان و وتاردەرەکە دەدەن.

لەشانۆدا ئەو کورسیانەی کەلە سەر شانۆ وئەکتەرەکانەوە نزیکە، نرخیان زۆرترە وگرانترە لەو کورسیانەی کەدورترن. شتێکی باش هەیە لەم کارەدا، ئەو کەسانەی کەلە وتاردەروە نزیکترن، چێژی زیاتر وەردەگرن وباشتر تێ دەگەن. ئەگەر کورسیەکانی ڕیزی پێشەوە ١٠ _ ٢٠پێ دورتر بن لە شانۆوە لەلای کرێکارەکانی هۆڵەکە ئیشێکی نائاسای نییە. منیش ئەم ڕێگەیە بە (( هاوار کردن لە شەقامدا )) ناو دەبەم. لەم شێوازەدا دەبێت هەوڵی زیاتر بدەن و وزەی زیاتر سەرف بکەن بۆ ئەوەی بتوانن پەیوەندی لەگەڵ ڕیزی یەکەمدا ببەستن. ئەم ئیشە هەم ئاڵۆزەو کێشەیەو هەم پێویستیش نییە.

ئەگەر بەیانی زوو بگەن، دەتوانن بە ئەوان بڵێن کە مێزو کورسیەکان بۆ پێشەوە بەرن. زۆربەی کات ناچار دەبن بۆ پڕکردنەوەی بۆشای پێشەوەی هۆڵەکە سێ ڕیز دەهێننەپێشەوە. من دەمەوێت کاتێک بچەمێمەوە، تەوقە لەگەڵ کەسانی ڕیزی پێشەوە بکەم.

## کورسیەکان بە بڵاوی دابنێن:

کۆتا باس لەبارەی دانیشتنەوە: ڕێکخستن ودانانی کورسیەکانی هوتێلەکان وهۆڵی کۆنفرانسەکان پەیوەندی بە لاوازی خەڵکی ئەو سەردەمە لەگەڵ ئەم سەردەمەدایە. بەم شێوەیە ئەگەر کورسیەکان بەتەواوی لەیەکەوە نزیک بن وجوت بن بەیەکەوە، هەندێ کاتیش جوتن بەیەکەوە، زۆربەی خەڵکی بەهۆی ئەوەی کە کەسێکی قەڵەو

لەتەنیشتیەوە دانیشتوە یان دادەنیشێت، یان دەبنەوە ناچیاران لەتەواوی وتاردانەکەدا خۆیان بچەمێننەوە لەکاتێکدا کە شانەکانیان بۆ پێشەوە چیەماوەتەوە وگویێ بۆ قسەکانی ئێوە دەگرن.

ئەگەر کورسیەکان لە یەکتر جیان واتە نەلکێنراون بەیەکەوە، بەئیش کەران بلێین کە مەودای نێوان هەر دوو کورسیەك ٤ ئینج یان زیاتر بێت. مەودا یان بۆشای نێوان کورسیەکان ڕاحەتی وئارامی بۆ ئامادەبوان دروست دەکات وئاسانتر گویێ بۆ قسەکانی ئێوە دەگرن.

بۆ بیسەران ئالۆزە کە بەهۆی بچوکی کورسیەکان وچەمینەوەیان ولە تەنیشت یەك دابنیشن وگویێ بۆ قسەکانتان بگرن _ بەتایبەتی ئەگەر ریزی یەکەم زۆر دورتر بێت لە شانۆوە. لەوانەیە ئەم بابەتە لە لای ئێوە گرنگیەکی وەهای نەبێت بەلاّم لەلای یەك بەیەکی ئامادەبوان گرنگیەکی زۆری هەیە.

## کونترۆڵی سەر شانۆ بکەن:

شوێنی بینینی وتاردەر پەیوەندی بەژمارەی ئامادەبوانەوە هەیە. هەرچی ئامادەبوان زۆرتر بن، سەرشانۆ یان ئەو شوێنەی کە وتاردەر وتاری لەسەر دەدات دەبێت بەرز بکرێتەوە.

یاسایەکی بەم شێوەیە: کەسانی ڕیزی دواوە دەبێت نیوەی سەرەوەی جەستەی ئێوە ببینن. واتە لەناوقەدەوە بۆ سەرەوە. لەبەر ئەمە بە زۆربونی ژمارەی ئامادەبوان وزیاد بونی ڕیزی کورسیەکان، دەبێت بەرزی سەر شانۆ یان ئەوشوێنەی کە ئێوە وتاری لەسەر دەدەن زیاتر بەرز بکرێتەوە .

هەنـدێك لــە وتــاردەران حەزدەكــەن كەلــە سەرشــانۆ بێنــە خــوارەوە ولەچواردەور ولەنێوان ئامادەبواندا بگەڕێن. بەبۆچوونی من لەم بارەیـەوە كە ئەم ئیشە ئیشێكی زۆر باشە بەلاَم كاریگەری نیە. بۆچی؟

چـونكە دوای ئـەوەی كـە وتـاردەر لەسـەر شـانۆ هاتـە خـوارەوە. ٨٠ تا٩٠٪بیسەران ناتوانن شێوە ودەم وچاوی ئەو ببینن. لەوانەیە ئـەم كـارە بۆ ئـەو كەسانەی كەلـە تەنیشت یـان دەورویـەری وتـاردەردان زۆر بـاش وسەرسوڕهێنەر بێت، بەلاَم ئامادەبوانی تـر ئەگـەری بینینـی وتـاردەر لـە دەست دەدەن.

## سیستمی دەنگی ڕێك بكەن:

سیستەمی دەنگی هوتێلەكان لەم سـالاَنەی دوایـدا بـەرەو پـێش چـووە. لەگـەڵ ئەوەشـدا بەهـەمان شـێوەی كەلـە بەشـی هەشـتەمدا باسـم كـرد. زۆربـەی جـار بەرپرسـانی هوتێلـەكان بـۆ ئـەوەی تـێ چـوون وپارەیـەكی كەمی تێبچێت سـود لـە سیسـتەمی دەنگـی هـەرزان بـەها وەردەگـرن. دواتر پێشـنیاریان كـرد كـە وتاردەرەكـان سیسـتەمی دەنگـی گـران بـەها لەگەڵ خۆیاندا بهێنن یـان سیسـتەمی دەنگـی گـران بـەها لـە هوتێلەكانـدا بەكرێ بگرن. لەبـەر ئەمـە سیسـتەمی دەنگیش دەسـكەوتێك دەبێـت بـۆ هوتێلەكان.

زۆربەی كۆمپانیا یا بەڕێوبەرەكانی سیمینارو ڕێكخراوە بەناوبانگـەكان كـە من ئیشیان لەگەڵدا دەكـەم، سیسـتەمی دەنگـی وپسـپۆڕان وشـارەزایانی دەنگ لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن. زۆربـەی ئـەو كەسـانەی كەلـە هوتێلەكانـدا كار دەكەن، سەر بە ڕێكخراون وبەڕێك وپێكی سیستەمی دەنگـی وتـاردەر گرنگی نادەن. ئەم ڕاستیەكی زۆر ناخۆشە بەلاَم ڕاستیە.

### ميكرۆفۆنەكان:

باشترين سيستمى دەنگى كەلەم رۆژانەدا سودى لىَ وەردەگيرێت، ميكرۆفۆنێكە كەوايەرێكى ناسكى رەنگى گۆشتى هەيە. كە قولاپێكى پێوەيە كەبەهۆى ئەو قولاپەوە لە گوىَ دەئالێنرێت تا تەنيشت گۆنا دێت. ئەم ئاميرە تەقريبەن لاى بيسەران نابينرێت ودەنگيشى روون وئاشكرايە دەنگى هەروەك زەنگى كلێسايە كەلە تەواوى هۆڵەكەدا بەروونى دەبيسرێت ئەم ئامێرانە رۆژ بەرۆژ زياتر وباشتر دەبن. وتاردەران سوديان لىَ وەردەگرن.

### ميكرۆفۆنى يەخەى:

باشترين وبەبەهاترين ميكرۆفۆن لە ئەمرۆدا ميكرۆفۆنى يەخەيیە. كە هەم بىَ وايەر وهەم وايەرداريشى هەيە. ميكرۆفۆنە بىَ وايەرەكان باشترن. كە بەهۆى گيرەيەكەوە بە بۆينباخ ويەخەتانەوە دەيلكێنن ئەوميكرۆفۆنە بە ئامێرێكەوە كەلە پشتانەوە بە قايشەكەتانەوە بەستراوەتەوە پەيوەندى هەيە وقسەكانتان بە ئێم پى فايەر ومكەبەرەى گەورە بلاّو دەكاتەوە كە بەرپرسى دەنگ لە تەنيشت ئەو مكەبەرانەدايەو كۆنترۆڵيان دەكات. ئێوە دەتوانن بەهۆى ئەم ميكرۆفۆنە يەخەييانەوە بە ئازادى بگەرێن ودەستەكانتان بجوڵێنن. هەر لەبەر ئەم هۆيە هەندىَ خەڵكى بەم ميكرۆفۆنانە دەڵێن:(( ميكرۆفۆنى ئازاد )).

دووەمين جۆرى ميكرۆفۆنى يەخەى، كەمن پێش لە پێشكەوتنى تەكنۆلۆژيا ودروست كردن وخستنە بازارِى ميكرۆفۆنەكانى تر ئەم ميكرۆفۆنە سيمدارەم بەكاردەهێنا. ئەم جۆرە ميكرۆفۆنە بەستراوەتە

بەسیمێکی بەرزەوە کەپەیوەندی بە سیستمی دەنگیەوە هەیە. ئەم جۆرە میکرۆفۆنانە زۆر ئاڵۆز نین، بۆ سیمینار وتاردانەکان زۆر گونجاوە. ئەگەر سیمی ئەم وایەرانە بەڕادەیەکی پێویست بەرز بێت، دەتوانن بەئاسانی بۆ هەر شوێنێك کەدەتانەوێت بڕۆن.

## ئەو میکرۆفۆنانەی کە بەدەستەوە دەگیرێن:

ئەم جۆرە میکرۆفۆنانە بۆ ناساندنی کەسێك یان باس کردنی چەند خاڵێکی گرنگی کورت گونجاوە. بەڵام بەکارهێنانی بۆ وتارێکی درێژ، ئاڵۆزەو ناچیارن کە لەیەك دەستی خۆتان سود وەربگرن. سود وەرگرتن لەیەك دەستیش لە باسکردنی وتارێکدا ئاڵۆز دەبێت.

لەکاتی بەکارهێنانی میکرۆفۆنی دەستی بەدڵنیایەوە دەبێت میکرۆفۆنەکە نزیك بکەنەوە لەدەمتان ولەژێر چیەناکەتاندا بێت.

بەڵام نابێت هێندە نزیکی بکەنەوە لە دەمتان کەبینەران نەتوانن نیوەی دەم وچاوتان ببینن! هەمیشە میکرۆفۆنەکە هەندێك لەخواردەم وچیەناکەتانەوە بگرن. دەبێت بەشێوەیەکیش بێت کەلە دەمتانەوە نزیك بێت. بەکورتیەکەی نابێت هێندە نزیك بێت لە دەم وچاوتانەوە کە بینەران نیوەی دەم وچاوتان نەبینن. نابێت هێندە دوریش بێت کە دەنگتان بەباشی ڕونی بڵاو نەبێتەوە.

## لێپرسراوی مێزی وتاردان:

زۆربەی وتاردانە بازرگانیەکان پێویستە لە پشت مێزی وتاردانەوە بدرێن. عادەتەن دەبێت یەك یان دوو میکرۆفۆن لەسەر مێزەکە بن، واباشە ئەم میکرۆفۆنانە تا ڕادەیەکی مام ناوەند لەدەمتانەوە نزیك بن. دواتر دەبێت

ڕێك بوەستن وهەندێك بۆ پێشەوە بچەمنەوە. بۆ قسەکردن لە میکرۆفۆنەکەدا وبۆئەوەی دەنگتان بەڕونی وبەباشی بڕوات و هەموو ئامادەبوان دەنگتان بەڕوونی ببیستن.

زۆربەی وتاردەرەکان لەدوری میکرۆفۆن وسەر شانۆوە دەوەستن نازانن کە دەنگیان بەڕوونی لە ناوهۆڵەکەدا دابەش نابێت وبە ئاڵۆزی بیسەران لێی تێ دەگەن. بۆیە بەدڵنیایەوە دەبێت هەندێك بۆ پێشەوە بچەمنەوە.

بەهیچی شێوەیەك دوودڵ مەبن لەنزیك بونتان لەسەر شانۆ. ئەم دوودڵیەتان دەبێتە هۆی ئەوەی کە بشڵەژێن وباوڕتان بەقسەکانی خۆتان نەبێت. دەتوانن بۆ دڵنیا بوون لە قسەکانتان دەستەکانتان بەکاربهێنن یان دەستەکانتان بەجەستەتانەوە بلکێنن یان کاتێك کەدەتانەوێت خاڵێکی گرنگ باس بکەن وخاڵەکە تەئکید بکەنەوە لەم کاتەدا دەستەکانتان بەرز بکەنەوە. بەلاّم هەرگیز بیرۆکەی دەست هێنان بەمێزی وتارداندا بەمێشکتاندا نەیەت.

تەنانەت واباشترە لە کاتی وتارداندا لەتەنیشت مێزەکەوە ڕاوەستن وجار بەجار چاو بەزانیاریەکان وبابەتەکاندا بخشێننەوە. هەرچی ئامادەبوان زیاتر جەستەی ئێوە ببینن، زیاتر لە وتارەکانتان چێژوەردەگرن.

## سود وەرگرتن لەئامێرە یارمەتی دەرەکان:

هەمیشە ئەو وتارانەی کەزیاتر لە ٦٠ خولەك دەبات بۆ ڕوون کردنەوەی خاڵە سەرەکیەکان ئامێرە یارمەتی دەرەکانی دەنگ وڕەنگ بەکار دەهێنم. وەهەروەها ٧٠٪ بیسەران کاتێك زانیاری وبابەتەکانی ئێوە

وەردەگرن کە دەبێت بیان بینن. ئەوان دەبێت قسەو زانیاریەکانتان بە نوسین ببینن.

ئەو ئامێرەی کە من بەکاری دەهێنم داتاشۆیە. من لەتەنیشت داتاشۆکەدا دەوەستم ولەسەر لاپەڕە ڕونەکانی بەشێوەیەکی گەورە دەنوسم بۆئەوەی بەشێوەیەکی جوان لەسەر لاپەڕەکە دەرکەوێت. هەرکاتێك کەبمەوێت خاڵێکی گرنگ باس بکەم، داتاشۆکە دادەگیرسێنم دواتر باسەکە لەسەر لاپەڕەی داتاشۆکە دەنوسم. چەند چرکەیەك دەوەستم و دواتر داتاشۆکە دەکوژێنمەوەو بەردەوام دەبم لەسەر قسەکانم.

## لەناوچون بۆ پاوەر پۆینت:

بەهەمان شێوەش کە پێشتر گوتم، ئێمە لەپیشەی وتاردانـدا دەڵێین: (( مردن ولەناوچوون بۆ پاوەرپۆینت )) چونکە بەهۆی هاتنی پاوەرپۆینت، زۆربەی خەڵکی بەگرنگترین هۆکاریان دانا لە وتاردانی خۆیاندا کاریگەری دەنگ، جەستە، ووشەکانی خۆیات لەبیر کرد. پاوەرپۆینت موهیم بوو، لەڕاستیدا نەدەبوایە بەم شێوەی لێ بهاتایە.

لەسود وەرگرتن لە پاوەرپۆینت یان هەر ئامێرێکی تر کەلە پێشدا ئامادە کراوە، دەبێت بەکارهێنای ئەو ئامێرانە بەشێوەیەك بێت کە ئامادەبوان سەرنجی شێوە ودەم وچاوی ئێوە بدەن. کاتێك کەلە کۆڕە بچووکەکاندا پاوەرپۆینت بەکاردەهێنم، هەرجاری وتەنیا یەك دێڕ نیشان دەدەم. پێش ئەوەی دێڕی دواتر نیشان بدەم، بەجوانی ڕوونی دەکەمەوە وباسی دەکەم. هەرگیز نابێت لەسەر ئسلایدەکە هێندە نوسین نیشان بدەن کە ئامادەبوان بەتەواوی سەرقاڵی خوێندنەوەی نوسین وزانیارییەکە بن، ئاگایان لەئێوە نەمێنێت وگوێتان بۆ نەگرن.

## ڕووبەڕووی بیسەران بن:

لەکاتی بەکارهێنانی پاوەرپۆینتدا، لاپتۆپێک لەگەڵ خۆتاندا بهێنن بۆ ئەوەی ئەو لاپەڕەو نوسینانەی کەلەسەر پەردەکە نیشانی دەدەن بتوانن لە ناو کۆمپیوتەرەکەدا بیبینن. هەرگیز سەیری پەردەکە مەکەن. هەرگیز ڕووتان لەبیسەران وەرمەجەرخێنن. هەمیشە لەکاتی وتاردانددا سەیری ئامادەبوان بکەن. کاتێک کەبابەتەکەتان نیشان دا، دەبێت بەشێوەیەک لاپەڕەکە بسڕنەوە بۆ ئەوەی چاوی ئامادەبوان بگوازرێتەوە بۆ سەر ئێوەو سەرنجی ئێوە بدەن.

## یاسای ٥×٥ تان لەبیر بێت:

دەبێت یاسای ٥لە٥ تان لەبیر بێت کەپێشتر باسمان کرد کە دەڵێت: هەرگیز زیاتر لە ٥دێڕ لەسەر پاوەرپۆینت مەنوسن هەر دێڕێکیش نابێت لەپێنج ووشە زیاتر بێت. سەرەڕای ئەوەش. دەبێت هەریەک لە ووشەکان هێندە گەورە بن کەدێڕەکە پڕ بکەنەوە. بۆ ئەوەی ڕیزی دواوە بتوانن بەئاسانی ووشەکان بخوێننەوە وتێکەڵی بابەتی سەرەکی وتاردانەکەی ئێوە بین.

هەمیشە ئەوەتان لە بیر بێت پاوەرپۆینت ئامێرێکی یارمەتی دەرە نەک بابەتی سەرەکی. پاوەرپۆینت تەنیا ئامێرێکە بۆ تەئکید کردن وجوان کردنی ئەو بابەتەی کە باسی دەکەن، بە تایبەتی کاتێك بابەتێکی ژماردن باس دەکەن.

## دڵنیا بوون لەهەموو شتەکان:

ئەگەر دەتانەوێت پاوەرپۆینت یان هەر ئامێرێکی تری کارەبای بەکاربهێنن، دەبێت زووتر لە شوێنی پێشکەش کردنی وتاردانددا ئامادەبن

ودڵنیابنەوە لە هەموو شتەکان پێش ئەوەی بچنە سەر شانۆ. دەبێت دڵنیابن لەنەبونی هیچی کێشەیەك لەنێوان پێویستیەکانی ناو کۆڕەکەدا، بۆئەوەی لەکاتی وتاردانەدا دوچاری هیچی کێشەیەك نەبنەوە.

## پلەی گەرمای هۆڵەکە کونترۆڵ بکەن:

٩٠٪ی ئەو کاتانەی کە وتاردانتان هەیە هەوای هۆڵەکە گونجاو نییە. لەهەندێ کاتدا هۆڵەکە زۆر ساردەو لەزۆربەی کاتیشدا هۆڵەکە زۆر گەرمە. ئەمەش لەبەر ئەوەیە: بەرهەمهێنان وبەکارهێنانی کارەبا بۆ داگیرساندنی ئامێری فێنککەرەوە یان ئامێری گەرم کەرەوە تێ چوونی هەیە. دوای ئەوەی هوتێل یان ئەو هۆڵەی کە ئێوە بە بڕێك پارەی دیاریکراو گرتوتانە، موهەندیسانی کارەبا هەموو ڕێگەیەك دەگرنە بەر بۆ ئەوەی تێ چوونی کارەبایان کەم بێت هەروەك ئەوەی بڵێیت کە فێرکراون بۆئەوەی ئەم ئیشە بکەن. هەرلەبەر ئەم هۆکارە ئامێری فێنك کەرەوە یان گەرمکەرەوە بە زووی دەکوژێننەوە یان هەر دایناگرسێنن.
من هەمیشە ئاگام لەم خاڵە دەبێت وسورم لەسەری کەکاتێك ئامادەبوان دێنە ژوورەوە دەبێت حەتمەن هەوای هۆڵەکە فێنك بێت. زۆر گرنگە کە ئەوان لەسەر ئەم خاڵە ڕێك بکەون کە دەبێت هەوای هۆڵەکە فێنك بێت، هەمیشە زۆر سەرم سوڕ دەمێنێت کە کاتژمێر ٦ی بەیانی گەرمای هۆڵەکە ٨٠تا٩٠ پلەی فەرەنهایتە وهەرگیز ئەم بابەتە پشت گوێ ناخەم. هیچی کاتێك کەسێك بۆ داگیرساندنی ئەم ئامێرانە بوونی نییە. زۆربەی پێشکەش کەرانی کۆڕەکە ناچار دەبن بەهاوارکردن ودەنگ بەرز کردنەوە بەرپرسانی هۆڵەکە ئاگادار بکەنەوە.

## هەرگیز باوڕ بەبەرپرسەکان مەکەن:

چەند ساڵێ لەمەوبەر لەکاتی وتاردانـدا لـە بـوکـاردتـن بـوم. دوای هـات وهاوارێکی زۆر لەبەر گەرما، بەرپرسانی هۆڵەکە ئامێری فێنک کـەرەوەیان داگیرساند. پلەی گەرمی هۆڵەکە ٨٥ پلەی فەرەنهایت بوو کە لەو کاتەدا ئامادەبوانیش دەهاتنە ژوورەوە. دوای ئـەوەی ئـامێری فێنـک کـەرەوەیان داگیرساند پلەی گەرما دابەزی بۆ ٧٥ پلەی فەرەنهایت. دوای ئەوەی کە چوومە سەر شانۆ بۆ وتاردان هەستم بەوەکرد کە موهەندیسەکان ئامێری فێنك کەرەوەکەیان کوژاندەوە، ئامێرەکە دەنگی نەما واتە کوژایەوە. پلەی گەرما وردە وردە دەستی کرد بەبەرزبونەوە تا گەشتە ٩٠ پلەی فەرەنهایت. بەهیچی شێوەیەك ئەمە جێی باوەڕ نەبوو! .

## پلەی گەرمای گونجاوی ناو هۆڵەکە:

باشترین پلەی گەرما ٦٨ پلەی فەرەنهایتە. لەم پلەیە کەمتر هەوای هۆڵەکە بەرەوسارد بوون دەچێت وزۆرتر لەم پلەیشە گەرمتر دەبێت ومێشکی مرۆڤ ناتوانێت بەباشی ئیش بکات. لەتەواوی دنیادا، دەبێت بۆ فێنك بوون و گونجاندنی هەوا هات وهاوار بکەیت.

لەکاتێکدا کەخەریکی ڕێککەوتنی بڕیار نامەکەن، ئەم قسەو ڕستانەشی بۆ زیاد بکەن: (( ئەگەر پلەی گەرمای هۆڵەکە بۆماوەی ٥ خولەك لە ٦٨ پلەی فەرنهایتەوە بەرز بویەوە ئەوا ئێمە هیچی پارەیەك نادەین. ))

هەندێك لە هاوڕێیانم کەلە وڵاتدا سیمینار ڕێك دەخەن. لە بڕیارنامەکەدا ئەو قسانە بەکاردێنن و لەهەندێ شوێنی جیاوازی هۆڵەکەدا گەرمی پێو دادەنێن. ئەوان گەرمی پێوەکە بەشێوەیەکی ڕێك وپێك کونترۆڵ دەکەن.

دوای ئەوەی کە گەرمی پێوەکە لە ٦٨ پلەی فەرەنەهایت پلەکە بەرزبویەوە، یەکێك لەئیش کەران یان بەرپرسانی هۆڵەکە بانگ دەکەن وگەرمی پێوەکەی پێ نیشان دەدەن. ئەوان بەبەرپرسەکان دەڵێن ۳ خولەك هۆڵەتتان هەیە بۆ ئەوەی گەرمای هۆڵکە بهێننەوە ئەو پلەیەی کە دیاری کراوە، بەدەر لەمە لەبری گرتنی هۆڵەکە هیچی پارەیەك نادەین. ئەڵبەتە بەرپرسانی هۆڵەکە بێزارن لەم ئیشە.

کۆتا خاڵ: کاتێك کە بەرپرسانی هۆڵەکە لەسەر ٦٨پلەی فەرەنەهایت رێك دەکەون، بەدڵنیاییەوە ئەمەیان پێ بڵێن: (( تاکاتێك من نەڵێم کەپلەی گەرما نزم یان بەرز بکەنەوە نابێت دەسکاری بکەن)) هەمیشە هەندێك لەئامادەبوان سەرمایانەو کاتێك کە پلەی گەرما دەگاتە ۷٥ پلەی فەرەنهایت، هەندێکی تریش گەرمایانە ولەتاو گەرمیدا ئارەقیان کردووە، ئەم کەسانە دەڕۆن بۆلای ئیش کەرانی هۆڵەکەو دەڵێن سەرما یان گەرمامانە پلەی گەرما بەرز یان نزم بکەنەوە. لەبەر ئەمە مەهێڵن ئەمە روو بدات.

## پوختە:

هۆڵی کۆنفرانس وسەر شانۆ گرنگترین هۆکاری ئێوەن. یەك بەیەکی بابەتەکان کاریگەری باش یان خراپی لەسەر بیسەران هەیە.

لەسەر وەرەقەیەك لەبارەی رێکخستنی روناکی، دەنگ، پلەی گەرما وسەرما بنوسن. وەدواتر وەرەقەکە نیشانی بەرپرسانی هۆڵەکە بدەن وبەیانی زوو بۆ ئەوشوێنە بڕۆن ولەگەڵ بەرپرساندا کۆنترۆڵی هۆڵەکە بکەن. هەمیشە چاوەڕوانی رووداوی کێشەکان بن. هەمیشە چاوەڕێی درۆکردن بن لە بەرپرسانی هوتێلەکە. لەکاتی خراپ بوونی بارودۆخدا ئەم

قسانە دەبیستن: (( لەبارەی ئەم بابەتەوە نیگەران مەبن، ئێمە خۆمان چارەسەری دەکەین. )) بەلاّم لە ڕاستیدا وانییە، بەڵکو بەم شێوەیەیە:

(( هیچی ئیشێك بە پێی داواکاری ئێوە نابێت. ))

هەر کاتێك دوودڵ بوون، ویستتان چاوتان بە بەڕێوبەر بکەوێت. ئەمە کۆتا چارەسەری ئێوەیە. ئیش کەران تەنیا مەبەستیان تێپەڕاندنی ئەو ڕۆژەیە. لەکاتێکدا بەڕێوبەر چاوەڕێی ئەوە دەکات کە جارێکی تر هۆڵەکە بگرنەوە.

کاتێك یەك بەیەکی بابەتەکانی ناو وەرەقەکە کونترۆڵ دەکەن، هیچی کەس جگە لەخۆتان لەم بابەتانە تێ ناگات. ئامادەبوان تێ ناگەن کەبۆچی لەسەر کورسیەکانیان بەڕاحەتی دانیشتوون وبۆچی هەموان بەئاسانی دەتوانن ئێوە ببینن. ئەوان تێ ناگەن کە بۆچی پلەی گەرما گونجاوە و بۆ چی دەنگتان ڕوونە. ئەوان خۆویستانە لەم مەسەلانە تێ ناگەن. بەلاّم خۆنەویستانە سپاسگوزارن وباسی وتارە باش وکاریگەرەکەی ئێوە دەکەن.

بەشی یانزدەیەم



# لێدانی كۆتای بوەشێنن: هەناسەیان بگرن

ئەگەر لەناخی دڵتانەوە كار بكەن، سەركەوتو دەبن
هیچ پێشبڕكێیەك بوونی نییە.
" ئەلبرت هوبارد"

وتاردانی باش وەك نمایشی فلیمێك، یان گۆرانیەكی باشە. بەڕاكێشانی سەرنجی بیسەران دەست پێ دەكات، خاڵ بەخاڵ بۆ پێشەوە دەڕۆن وبەسەركەوتویانە بە كۆتای دەگەن.

ئەو ووشانەی كەلە كاتی سەرتاو بەتایبەت لەكۆتای وتاردانەكەی خۆتاندا، دەیڵێن، پێش لە قسەكانی تری ئێوە لەمێشكی بیسەراندا دەمێنێتەوە. هەندێك لە وتاردەرەكانی مێژوو واتایەكی بەهێز وكاریگەریان هەبوە لە مێشكی مرۆڤدا هەرماونەتەوە.

بۆنمونە، لەماوەی جەنگی جیهانی دووەم، وینستۆن چی‌رچیل بەشێوەیەك ستایشی هێزی هەوای كرد كەلە هێرشێكی هەوای لەگەڵ ئەڵمانیەكاندا كوژران قسەكانی لەمێشكی هەموو خەڵكیدا تۆماركراوە وماوەتەوە. ئەو گوتی: (( لەماوەی مێژووی مرۆڤایەتیدا هەرگیز بەهۆی بابەتێكی بچوكی وەها هێندە زیان لە مرۆڤایەتی نەكەوتوە. ))

## بەشی كۆتای وتاردانەكەتان ووشە بەووشە بنوسنەوە:

بەمەبەستی دڵنیابوون لەباش پێشكەش كردنی بەشی كۆتای، دەبێت بەدڵنیایەوە ووشە بە ووشە ئەم بەشە بنوسنەوە.

كاتێك لەخۆتان دەپرسن: (( ئامانج لەم وتاردانە چىیيە؟ )) وەلآمتان دەبێت هەڵگری سەرەتاییەك بێت كە دەتانەوێت بیسەران دوای بیستنی وتاردانەكەی ئێوە ئەوان هەستن بەجێ بەجێ كردن. زۆر ئاسانە ئەگەر بتانەوێت باسی ئەنجامی كۆتای بابەتە ویستراوەكەی خۆتان بكەن.

باشترین زانیاری بۆ باس كردنی كۆتاییەكی باش ئەمەیە كەلە پێش باسكردنی ئەوەی كە ماوەتەوە. بەشی كۆتای باس بكەن. دواتر بۆ دواوە بگەرێنەوە بۆ ئەوبەشەی كەماوەتەوە، ناوەڕۆكی بابەتەكەتان لەم بەشەدایە كەدەتانەوێت بیروبڕوای خۆتان وبابەتێك باس بكەن كە دەتانەوێت ئامادەبوان دوای بیستنی قسەكانی خۆتان، قسەكانتانیان لەبیر بمێنێت وبۆ بەدی هێنان هەوڵ بدەن.

## وتاردانەكەی خۆتان بەبانگهێشت كردن بۆ دەست پێ كردن كۆتای پێبهێنن:

زۆر گرنگە داواكاریەكانتان بە بیسەران بڵێن دوای كۆتای وتارەكە. بانگهێشت كردن بۆ دەست پێ كردن باشترین رێگایە بۆ كۆتای پێهێنان بە وتارە كاریگەرەكەتان. سەرنجی ئەم نمونەیە بدەن: (( ئێمە شانس ودەرفەتانێكی گەورە لەبەردەماندایە، دەتوانین بەهاوكاری ئێوە بەم هەلە باشانە بكەین وساڵی داهاتو بگۆرین بە ساڵێكی باش وچالاكی خۆمان! ))

بەهەمان شێوەی کەبە کۆتـای نزیـك دەبینـەوە، گـوڕ وتینـی خۆتـان کـۆ بکەنەوە. بە هێزو دڵنیایەکی زۆرەوە قسە بکەن. قسـەی کۆتایتـان بڵـێن. دەبێت داواکاریەکانی خۆتان زۆر بەڕونی باس بکەن.

## بەباسکردنی پوختەی وتارەکەتان کۆتای بە قسەکانتان بهێنن:

ڕێگایەکی سادە بۆ هەر وتاردانێك هەیە: بە بیسەران بڵێن کە بڕیـارە چـی شتێکیان پـێ بڵـێن وە ئـەوەیان پـێ بڵـێن. دواتـر بەئـەوان بڵـێن کـە چـی شتێکیان پێ وتون. کاتێك بە کۆتـای باسـەکەتان نزیـك دەبنـەوە، شـتێك بەشێوەی (( مۆڵەت بدەن تا خاڵانێك بەشێوەیەکی پوخـت کـراو دووبـارە بڵێمەوە. . . . . . . )) بـاس بکـەن. دواتـر، خاڵـە سـەرەکیەکانی خۆتـان بمەنە پێڕستێك و دووبارە باسیان بکەنەوە و نیشانی بدەن کە چۆن ئـەم خاڵانـە پەیوەنـدییان بەیەکـەوە هەیـە. بیسـەران لـە دووبـارە کردنـەوەی بابەتێك بیستویانە، خۆشحاڵ دەبن وبەم شـێوەیە تێدەگـەن کـە بـەکۆتای وتاردانەکە نزیك دەبنەوە.

## وتاردانەکە بە باس کردنی چیرۆکێك کۆتای پێ بهێنن:

دەتوانن کە گەشتنە کۆتای وتاردانەکە، بڵێن: (( مۆڵـەت بـدەن بـۆ پشـت ڕاست کردن یان جوانکردنی ئەو بابەتەی کـە باسـم کـرد چـیرۆکێکتان بـۆ باس بکـەم. . . . . . . )) دواتـر چـیرۆکێك بـاس بکـەن کـە ئـەنجامێکی باشی هەیە وخەڵکی شتی لێوە فێر دەبن، بۆ ئەوانی باس بکەن وئەنجامە باشەکەیان بۆ دووبارە بکەنەوە.

زۆربەی کـات دوای باسـکردنی چـیرۆکەکە دەتـوانن ئـەنجامی چـیرۆکەکەو کۆتای باسەکە بەیەکەوە ببەستنەوە، سەرنجی ئەم نمونەیە بدەن:

ڕۆژێ لەڕۆژان، لەچەندین ساڵی ڕابردوودا، دوو هاوڕێ بۆ گەڕان بەدوای زێڕدا لە ڕۆژهەڵاتەو چوون بۆڕۆژئاوا. ئەوان ئەو پارچەیە زەویەی کە دڵنیا بون لێی کە ئاڵتونی تێدا بێت. پەرژینیان کردوو دەستیان کردبە هەڵکەندنی زەویەکە بۆ ئەوەی ئاڵتونەکە بدۆزنەوە. ساڵێکی تەواو، لە هەموو ڕۆژەکانی هەفتەدا ئیشیان دەکرد زەویەکەیان تا دەهات زەویەکەیان قوڵتر وقوڵتر دەکرد. بەڵام تەنیا شتێك کە دەستیان دەکەوت بەردە بێ بەهاکان بوو. بەبێ ئومێدی وبێ هیوای زەویەکەیان بە چەند دۆلارێکی کەم بە یەکێك لە کڕیارەکانیان فرۆشت وگەڕانەوە بۆ ڕۆژهەڵات بۆ ئەوەی دەست بکەن بەئیش وپیشەیەکی تر بۆ ژیانێکی نوێ بنیاد بنێن.

دواتر تێ گەشتن کە کڕیاری زەویەکەی ئەوان موهەندیسی تایبەتی بردوەتە سەر زەوییەکە بۆ ئەوەی پشکنین بۆ زەوییەکە بکات. موهەندیسەکە بەئەوانی گوتبو کەلەم زەویەدا ئاڵتون بونی هەیە. بەڵام خاوەنەکانی پێشوی زەویەکە شوێنێکی هەڵەیان هەڵکەندووە. ئەگەر کڕیاری ئەم زەوییە شوێنێکی تر هەڵبکەنێت ئەوا بەدڵنیایەوە دەگاتە زێڕ.

تەنیا ٧٠مەتر دوورتر لەو شوێنەی کە دووهاوڕێکە هەڵیان کەندبوو، کەسە کڕیارەکە زەویەکەی هەڵکەند تا گەشتە بڕێکی زۆر لە ئاڵتون کە بەهای ٤٠ ملیۆن دۆلار بوو.

دوو هاوڕێ گەنجەکە بە بیستنی ئەم هەواڵە تێ گەشتن کە ژیانی ئەوانیان خۆش کردووە و سەرکەوتو بون. ئەو دوو هاوڕێیە بڕیاریان دا کەلەمەو دواتر هەندێك زیاتر خۆیان ماندو بکەن وهەوڵ بدەن، هەندێك

زیاتر هەڵبکەنن، لە هەر ئیشێکدا کە سەرقاڵی ئیش کردن بن ببنە پسپۆڕ لەو ئیشەدا.

خوشکان وبرایان، ئێمەش لەگەڕان بەدوای زێڕداین. توانای بەهێزی مێشکی ئێمە بێ سنورە. وەرن با زانیاریەکانمان لەگەڵ یەکتردا باس بکەین، هەندێك زیاتر هەوڵ لەگەڵ یەکتردا بدەین، تا ئەو کاتەی کە بەسەرکەوتن نەگەشتوین وازنەهێنین و بەردەوام بین.

ئەوان بخەنە پێکەنین:

ئێوە دەتوانن بەباسکردنی یان چیرۆکێکی پێکەنین کە پەیوەندی بەبابەتەکەو هەیە، کۆتای بە وتاداردانەکەتان بهێنن. من لە درێژەی وتارەکانی خۆمدا باسی ئەو هەنگاوانە دەکەم کە پێویستە بیان نێین. دواتر ئەم چیرۆکە دەگێڕمەوە. ئال و سون لە جەنگەلێکدا تەقەیان لە ئاسکێك کردوو بریندایان کرد ودواتر بەکلك ئاسکەکەیان ڕادەکێشا بۆ لای ئۆتۆمبیلەکەیان واتە بەپشتا ڕایان دەکێشا. بەلأم لە ڕێگەدا توشی کێشە دەبون وهەندێ کات کلکی ئاسکەکەیان بۆ نەدەگیراو بەردەبوو.

جوتیارێك لەوان دەپرسێت چی دەکەن؟

ئەوان گوتیان: سەرقاڵی بردنی ئەم ئاسکەین بۆلای ئۆتۆمبیلەکەمان.

جوتیارەکە بە ئەوانی گوت: ئێوە بۆ گواستنەوەی ئاسکەکە نابێت کلکی بگرن بەڵکو دەبێت سود لەدەستەکانی بگرن. کەخودا بەئەوی داوە ئال و سون بە ئەویان گوت: سپاس بۆ پێشنیارەکەت.

ئەوان لەبری ئەوەی ئاسکەکە وەربگێڕنەوە بۆ ئەوەی سەری ئاسکەکە بکرێتە خۆیان ئەمان چیونە پێش ئاسکەکە واتە بە ڕێگەکەیان پێچیەوانەوە بویەوە لەبری ئەوەش دەستی بگرن شاخەکانی

ئاسکەکەیان دەگرت وڕایان دەکێشا. نزیکەی پێنج خولەك لە ڕاکێشانی ئاسکەکەو ڕۆشتنیان، ئال بە سونی گوت: سون، جوتیارەکە ڕاستی گوت بەم جۆرە باشترو ئاسانترە.

سون وەلامی دایەوەو گوتی: بەڵێ ئال، بەلام ئێمە تا زیاتر بڕۆین دورترو دورتر دەبینەوە لە ئۆتۆمبیلەکەمان.

کاتێك کە پێکەنینەکان تەواو بون دەڵێین: (( زۆربەی خەڵکی لە ژیانیاندا لەبەر ئەوەی ڕێگەیەکی ئاسان هەیە بەرەو ئەویٚ هەنگاو دەنێن، ئەگەر چی ڕێگەکەشیان پێچ‌ەوانە بێت. بەلام لە ڕاستیدا لە ئامانجەکانی خۆیان زیاتر وزیاتر دوردەکەونەوە. ))

## وتاردانەکەی خۆتان بە خوێندنەوەی شێعرێك کۆتای پیٚ بهێنن:

شیعرێکی زۆر هەن کە پەیوەندیان بە خاڵە سەرەکیەکان وبابەتەکانی وتارەکەی ئێوەوە هەیە. دەتوانن شێعری خۆشەویستی کاریگەر هەڵبژێرن.

چەندین ساڵ لەمەوبەر بە خاك سپاردنی یەکێك لە هاوڕێیاتم کە بەهۆی شێرپەنجەی مێشکەوە مرد، بابەتی بەخاك سپاردنەکە کەلە وەرەقەیکدا نوسیبوم خوێندمەوە. لەسەردەمی جەنگی جیهانی دووەم فرۆکەوان بوو، ئەو هەرگیز ئەو ئەزمونانەی کە لە ئەفریقای باکور وەری گرتبوو یان فێری بوو بوو بیری نەدەچۆیەوە. دوای باسکردنی باش بونی ئەو ئیشە باشەکانی کە لەگەڵ خێزان و، هاوڕێیانی زانکۆی کردبووی، قسەکانم بە خوێندنەوەی (( فڕۆکەوان )) کۆتای پیٚ هێنا. ئەم شیعرە واتاکەی ئەوەبوو: (( ئەو لەسنورەکانی زەوی زیاتر ڕۆشت نزیکی خودا بویەوە. ))

## لەبابەتە ئیلهام بەخشەکان سود وەربگرن:

ئێوە دەتوانن وتاردانەکەی خۆتان بەبابەتێکی ئیلهام بەخش کۆتای پێ بهێنن. وەهەروەها ئەو قسە دڵخۆشکەرانەی کەلە وتارەکەدا بەکارتان هێناون، لە یادتان بێت کە ئومێد، هیوا هەمیشە بیرو بۆچوونی مێشکی خەڵکیە. خەڵکی حەز دەکەن بەهۆی ئەنجامدانی ئیشە جۆراوجۆرەکان لە داهاتودا ستایش بکرێن.

هەمیشە ئەوەتان لەبیر بێت کە بیسەران دوچەاری کێشەو، ناڕەحەتی، بێ ئومێدی دەبنەوە، هەموان ئەو شیعرەیان پێ خۆشە کە هانی ئەوان دەدات کە ڕووبەڕووی ناڕەحەتیەکان ببنەوە.

من ساڵێکە سیمینارەکانی خۆم بە شیعری ڕابرت دەبلیۆ کۆتای پێ دێنم: (( واز مەهێنە )) یا (( بەردەوام بە! ))

کاتێك چیرۆك یان سیعرەکە دووبارە دەڵێیتەوەو، دەبێت وەك ئەکتەرێك بن. دەبێت ووشەکانی خۆتان بژمێرن وبەهەستێکی خۆشەویستانەوە باسی بکەن. ڕاهێنان بکەن لەسەر تەواوی شێوازەکانی ئەم کتێبە. لەکاتی خوێندنەوەی نیوە دێری سەرەکی شیعرەکە دەنگی خۆتان بەرز بکەنەوە، لەکاتی خوێندنەوەی بەشە هەستیارەکە دەنگی خۆتان نزم بکەنەوە. جارجار لەگەڵ ووشە شیعریەکاندا مۆسیقا بەدەنگی بەرز بەکاربهێنن و کاتێك بەیادەوەریەکان گەشتن دەنگی مۆسیقاکە نزم بکەنەوە.

بەتایبەتی دووبەرامبەری بێدەنگیەکانی وتاردان بێ دەنگ بن. لە بێدەنگیە کاریگەریەکان سود وەربگرن کاتێك بەکۆتای دێڕی شیعرەکە گەیشتن، بۆ ئەوەی بیسەران بگەنەوە بە ئێوەدا وئەوەی کە

خوێندوتانەوە لێکی بدەنەوە لەبێدەنگیەکی زۆر سود وەربگرن ئەگەر بابەتە شیعریەکە پێکەنیناویە، پێ بکەنن، ئەگەر بابەتی هەستیاریە بەجدی وەریبگرن.

بەدڵنیایەوە کاتێك گەشتنە کۆتا دێڕی شیعرەکە لەبری دەنگ نزم کردنەوە دەنگی خۆتان بەرز بکەنەوە. چاوەڕێی (( نیشانەی سەرسوڕمان )) بن لەکۆتای شیعرەکەدا.

## نیشان بدەن کە وتاردانەکە تەواو بووە:

کاتێك کۆتا ووشەی وتاردانەکە دەڵێن دەبێت هەموان تێ بگەن کە وتاردانەکەتان تەواو بووە. هیچی ئاڵۆزیەك و ناڕونیەك نابێت لە مێشکی بیسەراندا هەبێت. ئەوان دەبێت بزانن کە ئەم کاتە کۆتای وتارەکەیە.

زۆربەی وتاردەران وتارەکانی خۆیان لەپڕدا کۆتای پێ دێنن و دەڵێن: (( سپاس گوزارم )) بەڵام ئەمە شێوازێکی ڕاست نییە: ئەمە کۆتای پێ هێنانێکی بەهێز نییەو لە گرنگی وتاردانەکە کەم دەکاتەوە کاتێك بە کۆتای وتاردانەکە دەگەن، بە شێوەیەکی ڕێك وڕاست بەرامبەر بە کەسەکان بوەستن. جارێکی تریش دەمو چاوێکی هاوڕێیانە بدۆزنەوەو ڕاستەوخۆ بگەڕێنەوە بۆ لای. ئەگەر کاتی گونجاو هەبوو، وەك نیشانەیەك بۆ کۆتای پێ هێنان زەردەخەنەیەك بەرامبەر بە کەسە بکەن.

ڕێگری بکەن لە ڕۆشتن بۆ لای سەرشانۆ و کۆکردنەوەی وەرەقەکان یان یاری کردن بە میکرۆفۆنەکان و جل وبەرگەکانتان.

## مۆڵەت بدەن ستایشتان بکەن:

ئامادەبوان دەیانەوێت کە دوای کۆتای وتاردانەکە ستایشی ئێوە بکەن. هەندێك لە ئامادەبوان زووتر لەوانی تر تێ دەگەن کە وتاردانەکە تەواو بووە. لەزۆربەی بابەتەکاندا، کاتێك کۆتا قسەی خۆتان دەکەن و واز لە قسەکردن دەهێنن، ئامادەبوان بەتەواوی بێدەنگ دەبن. لەوانەیە ئەوان چاوەڕێی قسەکردن بن لە ئێوە لە بارەی کۆتای بابەتەوە. دوای چەند چرکەیەك، ئامادەبوان دەست بە ستایش کردن دەکەن کەلە یەك کەسەوە بۆ دووکەس ولە دووکەسەوە زیاد دەکات تا دەگاتە ئەوەی کە تەواوی هۆڵەکە چەپڵە لێ دەدەن. کاتێك یەکەم کەس دەستی کرد بە چەپڵە لێدان، ڕاستەوخۆ سەیری ئەوو بکەن، ووشەی سپاستان دەکەم بەکاربهێنن.

## بۆ ڕێز گرتن لە ئێوە هەڵدەستنەوەو چەپڵە لێ دەدەن:

ئەگەر وتاردانەکەی ئێوە بە ڕاستی کاریگەر بوویێت و توانیبێتان بە باشی پەیوەندی لەگەڵ بیسەراندا دروست بکەن، یەکێك لە ئامادەبوان هەڵدەستێتەوەوە چەپڵەتان بۆ لێ دەدات. کاتێك وەها ڕووداوێك ڕوویدا ڕاستەوخۆ سەیری ستایش کەرەکە بکەن و بە گوتنی ووشەی سپاستان دەکەم. هانی ئەوانی دیکەش دەدەن بۆ ئەم کارە. کاتێك خەڵکی دەبینن هەندێك لە ئامادەبوان هەستاونەتەوە، چەپڵە لێ دەدەن. ئەوانی دیکەش هەڵدەستن بەجێ بەجێ کردنی هەمان ئیش.

هەندێ کاتیش پێش دێت کە وتاردەر دوای تەواوکردنی وتاردانەکەی خۆی بەبێ دەنگی لەبەردەم ئامادەبواندا دەوەستێت، لەگەڵ بێدەنگی

ئەواندا ڕووبەڕوو دەبێتەوە. بەلاّم ئەگەر وتاردەر بەئارامی بوەستێت وچاوەڕێ بێت تا ئەو کاتەی کە بیسەران تێ دەگەن کە بابەتەکە تەواو بووە، ئەوان بەیەکەوە دەست بە لێ دانی چەپڵە دەکەن. زۆربەیان لەسەر کورسیەکانی خۆیان هەڵدەستنەوە.

ئەگەر یەکێك لەو کەسانەی کەلە ڕیزی پێشەوەن لە شوێنەکەی خۆی هەستێتەوە وستایشی ئێوەی کرد، بۆ پێشەوە بڕۆن دانەوێننەوە یان خۆتان کۆڕ بکەنەوە تەوقەی لەگەڵدا بکەن. کاتێك دەستی یەکێك لەوان دەگوشن، ئەوانی دیکەش وا هەست دەکەن کە دەستی ئەوانیش دەگوشن و سپاسی ئەوانیشتان کردووە. دوتر ئەوانیش لەشوێنەکەی خۆیاندا هەڵدەستنەوە و ستایشتان دەکەن. هەر بەم شێوەیە تەواوی هۆڵەکە هەڵدەستنەوە بەردەوام دەبن لەستایش کردن وچەپڵە لێدان.

ئەگەر ئامادەبوان ستایشیان کردن چی نەیان کرد، کاتێك ناسێنەرەکەی ئێوە هاتە سەر شانۆ بۆ لەبری ئەوەی ئەوان سپاسگوزاری ئێوە بکات، پێبکەنن ودەستی ئەو بەگەرمی بگوشن. ئەگەر باروودۆخەکەش گونجاو بوو. لەباوەشی بگرن وبەشێوەیەکی هاوڕێیانە دەست بۆ ئامادەبوان بجوڵێنن و سەر شانۆ بەجێ بهێڵن.

## هێزی باش قسەکردن:

توانای باش قسەکردن لەهەر ئیش وکارێکدا کاریگەری گەورەی لەسەر ژیانی ئێوە دەبێت. باش قسەکردن دەتوانێت سەرنجی ئەو کەسانە ڕابکێشێت کە دەتوانن یارمەتی ئێوە بدەن. هەروەها دەتوانن لە پەیدا کردنی پیشەیەکی باشتردا هاوکاری ئێوە بکەن.

لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە توانای باس کردنی وتارێکی گرنگ چی بۆ کۆمەڵێکی بچووك یان چی بۆ کۆمەڵێکی گەورە دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی ڕێزی زیاتری ئێوە بگرن، وەشانازیتان پێوە بکەن. کاتێك دەزانن کە دەتوانن کاریگەریتان لەسەر خەڵکی هەبێت و ئەوان بە شێوە جیاوازەکان ڕازی بکەن، هەستی ئەوەتان بۆ پەیدا دەبێت کە هەموو ئیشێك بە کۆتا بگەیەنن.

**پوختە:**

قسەکانی کۆتای ئێوە دەتوانێت کاریگەری لەسەر بیسەران هەبێت. هەڵبژاردنی ووشەکانتان بە وردی، دەتوانێت کاریگەری لە سەر بیر وبۆچوون وکردارو هەستی بیسەران هەبێت. هەندێ جاریش ژیانی ئەوان دەگۆڕێت.

بەشی دوانزەیەم



# وتاردان بەمەبەستی فرۆشتن

تاکە سێک شتێک نەفرۆشێت هیچی شتێک ڕوو نادات.

"رد موتلی"

هەموو خەڵکی بە ئیشی فرۆشتنەوە سەرقاڵن. پرسیارەکە ئەمەیە: تا چی ڕادەیەك شارەزایتان لەم کارەدا هەیە؟ زۆرێك لە خەڵکی بەهۆی بوونی نەیارێکی زۆر لە خەڵکی یان شکست هێنان لە هاندانی خەڵك بۆ کڕین لە فرۆشتن دوور دەکەونەوە. لە ئەنجامدا هەمان بیرکردنەوە (( لە کڕین)) بۆ زۆرێك لە خەڵکی ئازاردەرە.

بەهەمان شێوەی کەلە بەشی سێدا وتمان خەڵکی لەسەرنەکەوتن وبەرهەڵستی کردنیان زۆر دەترسن. هەندێ کات ئەم ترسانە وەها لەمێشکماندا گەورە دەبن کە دەبنە هۆی ئەوەی کە ژیانیان بگۆڕدرێت. ئەو هەل وشانسانەی کە دێتە پێشەوە بۆیان لەبەر ئەوەی کە ترسی شکست وبەرهەڵستیان هەیە لێیان دووردەکەونەوە.

خەڵکی پەیوەندیانێك هەڵدەبژێرن کە زۆرترین ئەگەری وەرگرتنیان هەبێت. خەڵکانێکیش دەستنیشان دەکەن کە ئەگەر سەرنەکەوتنیان تێدا کەم بێت. خەڵکی لەگەڵ کەسانێکدا پەیوەندی کۆمەڵایەتی دروست

دەكەن وبەردەوام دەبن لەگەڵیاندا كە قەبوڵیان بكەن (( بەهەمان شێوەی كە هەن )) هەر دەبن.

## هاندان هۆكاری سەرەكیە:

لەگەڵ ئەم هەموەدا، تەواوی خەڵكی بەشێوازێك خەریكی فرۆشتنن. هەموان بۆ قەبوڵ كردنی بیروبۆچونەكانیان هانی یەكتری دەدەن. تەنانەت ئەگەر هانی خێزانەكت بدەیت بۆ خواردنی ژەمە خۆراكێك لەیەكێك لە چێشتخانەكاندا یان هانی منداڵان دەدەن بۆ ئەوەی بچنە سەر جێگەی خەوەكانیان، بە جۆرێك سەرقاڵی فرۆشتنن.

بێ گومان خەڵكی خۆیان وەها بیرناكەنەوە. بۆ نمونە، جارێكیان بۆ ژمارەیەكی زۆری ژمێریار لە كۆمپانیایەكی گەورەی نێودەوڵەتی قسەم دەكرد. ئەم كۆمپانیا داوای لە من كرد كەلەبارەی جۆرەكانی هاندان و بانگهێشت كردنەوە قسە بكەم. من قسەكانی خۆم بە پرسیارە دەست پێ كرد:(( چەند كەس لە ئامادەبوان لێرەدا سەرقاڵی فرۆشتنن؟ ))

هەموان بەتەواوی بێدەنگ بون. یەكێك لە هۆكارەكان كە ژمێریارە بەناوبانگەكان ژمێریاریان هەڵبژاردووە ئەمەیە كە ئەوان هەرگیز دەست بە فرۆشتنی شتێك ناكەن بە كەسێك و مەسەلەی فرۆشتن بۆ ئەوان گرنگی نییە.

من بۆ چەند چركەیەك بێدەنگ بوم و دواتر گوتم: ((لەوانەیە پرسیارەكەی من تا ئاستی پێویست روون نەبێت. چەند كەس لەئامادەبوانی ئێرە بەڕاستی خەریكی فرۆشتنن؟ ))

دوای چەند چركەیەك بێدەنگی، بەڕێوبەری گەورەی ڕێكخراوەكە لە مەبەستم تێ گەشت. ئەو بەهێمنی دەستی خۆی بەرز كردەوە سەیری

چواردەوری خۆی کرد. کاتێک ئامادەبووە ژمێریارەکان بینیان کە بەڕێوبەرەکەیان دەستی بەرزکردوەتەوە، یەکە بەیەکە تێ گەشتن کە ئەوانیش سەرقاڵی فرۆشتنن.

## هەموان سەرقاڵی فرۆشتنن:

دواتر لەئەوانم پرسی:(( چەند کەس لە ئێوە بۆ هێنانی ئیش وکارێکی تازە بۆ کۆمپانیا لێرەدا ئامادەن؟ چی ئەندازەیەك لە دەسکەوت وبەرەوپێش چیونەکانی ئێوە پەیوەندی بە هێنانی کڕیاری زیاتر بۆ کۆمپانیا و زیادبونی دەسکەوتی ساڵانەی کۆمپانیاوە هەیە؟ . ))

هەموان بەبێ دواکەوتن دەستی خۆیان بەرز کردەوە. من گوتم: (( لەبەر ئەمە، هەموو ئامادەبوانی حازر لەم کۆمەڵەیەدا سەرقاڵی ئالو وێرن. بابەتەکە ئەمەیە کە تا چی ڕادەیەك شارەزاییان لەم بارەیەوە هەیە؟ تا چەند خولەکێکی تر، بابەتێکتان پێ دەڵێم کە لەکاتی ڕووبەڕووبونەوەی کڕیارە دوودڵەکان، باشتر لە جاران بتوانن هانی ئەوان بدەن وبیانهێنن ).

### فرۆشتنی بۆچونەکانی خۆتان:

وتاربێژی لەناو خەڵکدا جۆرێکە لە فرۆشتن وشێوازی خستن ڕووی بەرهەم بۆ فرۆشتن زۆر هاوشێوەی شێوازی بەکاربردوو لە وتاربێژی بۆ گشتییە. لەگەڵ ئەمەش، هەرچەند گوێگرەکان ئێوەیان خۆشتر بوێت زیاتر متمانەتان پێ دەکەن، ترسی ئەوان لە قەبوڵ کردنی بۆچیونەکانتان کەمتر دەبێتەوە. هەرچەند متمانە زیاترتان پێ بکەن، زیاتر لە ژێر فشاری ئێوەدا دەبن. کاتێك بەتەواوی متمانەیان ئە ئێوەیە، بۆ هەموو ئامۆژگاریەکانی ئێوە گوێ ڕایەڵ دەبن. ئامانج لە وتاربێژی هاوشێوەی

کرین وفرۆشتنە، ئامانجی قسەکردن بۆ هەرکەس وگروپێك بریتیە لە ڕازیکردنیان. بۆ بیرکردنەوە وڕەفتارکردنیان بە شێوازێکی جیاوازتر.
ئێوە هەمیشە هەڵبژاردنێکتان هەیە: ئێوە دەتوانن ڕازی کەر وکاریگەر بن یان ڕازی کراو وخۆش باوەڕ بن. ئێوە دەتوانن هاوکارو یارمەتی دەری خەڵکی بن یان دەتوانن هاوکاری ویارمەتی خەڵکی بەدەست بێنن.
هەڵبژاردنەکە لەدەست خۆتاندایە.
هەواڵە دڵ خۆشکەرەکە ئەوەیە کەئەم کرین وفرۆشتنە (( وتاردان )) شایەنی فێربوونە هەموو فرۆشیارە ناودارەکانی ئەمرۆ، ڕۆژێك لە ڕۆژان بێ ناو بوون. زۆربەی ئەو کەسانەی کە ئەمرۆ لە ١٠٪ کەسە سەرکەوتوەکان لە سەردەمانێك لە ١٠٪ی کەسە لاوازەکان بوون. لەگەڵ ڕاهێنان ودووبارە کردنەوەدا ئێوە دەتوانن تواناکانی قایل کردن، پەیوەندی کردنتان زیاد بکەن وکاریگەرتر بن لە فرۆشتندا هەموو تواناکانی فرۆشتن شایەنی فێربوونە.

## ترسیان کەمبکەنەوە و کاریگەریەکانتان زیاد بکەن:

وەکو پێشتر ئامازەم پێدا هەموو کەسێ ترسی هەیە لەو بەرهەمەی کە دەیکڕێت. ترس لە کاریگەریەکەی ترس لە سود وەرگرتن لێی. کەس نایەوێت شتێك بفرۆشێت کە کەس نەیەوەێ، پێویستی پێ نەبێت یان نرخەکەی بەرز بێت.
کەس نایەوێت بڕواتە ناو شتێکەوە کەدواتر ئارەزوو بەنەکردنی بکات (داخ بخوات بۆی ) بۆیە هەرکاتێك کڕیارێك دێت بۆ بینینی بەرهەمەکەت، خزمەتگوزاریەکەت، یان بیرۆکەکەت ئەو بەسەری سەپێنراوە لە ئەزموونەکانی ڕابردویەوە کە بینیونی بەئاگا، دوودڵ بەگومان بێت لە

ئەنجامدانی هەر هەڵەیەك. یەکەم کارت کە بیکەیت لە مامەڵەکەتدا بریتیە لە کەمکردنەوەی ئەو ترسەی کە هەیەتی جێگەکرتنەوەی بە باوڕبەخۆبوون ودڵنیای.

هەندێ کات پرسیار لە بینەرەکان دەکەم ودەڵێم:"گرنگترین ووشە لە مامەڵەکردن و ژیانی کۆمەلایەتیدا چیییە؟ ئەو تاکە ووشەیە چیییە کە بڕیار دەدات چەند دەفرۆشیت، بە چی خێرایەك دەیکەیت؟ چۆن ژیانێکی ستاندارد، شێوازی ژیانت، هەموو شتێکی خەیاڵی وڕاستی بەدەست دێنیت؟ زۆربەی کاتەکان بۆ وەلامی ئەمە بێدەنگیەکی درێژ وەلامەکەی دەبێت، دواتر پێیان دەڵێم "متمانە " گرنگترین ووشەیە بۆ سەرکەوتن لە کێشە گشتیەکاندا، قسەکردن لە کڕین وفرۆشتن، بازرگانیدا بەڵێ"متمانە بوون " بە هۆی ئەوەو خەڵکێکی زیاتر باوڕت پێ دەکات. ئەوان زیاتر کراوە دەبن لەگەڵت کە ئەمەش هەلی ڕازیکردنیان لەلایەن ئێوەوە زیاتر دەکات.

## هەموو شتێك کاردەکاتە سەر دڵنیای:

چەرخوفەلەقێك بهێنەرە بەرچاوی خۆت، کاتێك کە بۆیەکەم جار کڕیارەکە دەبینێت سەرێکی چیەرخوفەلەقەکە زۆر بەرزە. ئەمە ترسی کڕیارەکە ئەنوێنێت لە کردنی هەڵە بەرامبەرتان لە کاتی مامەڵە کردنیدا. لایەکەی تری چەرخ و فەلەقەکە زۆر نزمە ئەمەیان ئاستی متمانە بونیەتی لە سەرەتادا.

هەمووشتێك کە لەسەرەتادا ئەیکەین هەر لە پەیوەندی بە موبایل، ئیمەیل، یان کەسی خۆت کاردەکاتە سەر ئەم هاوسەنگیە ئەمەیان ئاستی متمانەکەت زیاد یان کەم دەکات. هەمو شتێك دەژمێررێت.

ڕێگەی قسەکرنتان، ڕۆشتنتان، وتاردانتان، جل وبەرگتان، تەوقەکردنتان بەهەمان شێوە کاریگەری هەیە لە بەرزبونەوەی یان نزم بونەوەی متمانە بوون پێتان.

بەئامانجی ئەوەی کڕین وفرۆشتنێك ڕوویدات دەبێت ترسی کڕیاری بەرامبەرتان دابەزێنن وهەروەها متمانەیان بۆ لای خۆتان بەرز بکەنەوە. بەم شێوەیە کڕیارەکان دەتوانن بەباوڕەوە هەڵسوکەوتان لەگەڵدا بکەن. "ئێمە دڵێین کەوا "هەموو کەسێك حەز دەکات کە پارە بدات ویکڕێت "نەك بفرۆشێت " هەموو کەسێك گومانی باش، خراپی هەیە وبەئاگایە بەرامبەر هەر هەوڵێك بۆ قایل کردنی بۆ بیرکردنەویان یان کردنی شتێکی جیاوازترلەوەی کە ئێستا دەیکات. هەموو کەسێك زیانی پێ گەیەنراوە پێشتر، بۆیە بڕیاریان داوە کە چیتر ئەو زیانانە دووبارە نەبنەوە بەبەرزکردنەوەی متمانی خۆتان لایان دەتوانن ئەم ترسە یان "یان ئەم زیان پێ گەیاندنە کەم بکرێتەوە.

حەوت هەنگا بۆ قایل کردنێکی قایل کەر:

پرۆسەی قایل کردنی کەسێك یان گروپێك پێکدێت لە حەوت هەنگاو. کاتێ ئێوە وتاردەدەن و دەتانەوێت بینەرەکانتان قایل بکەن. دەبێت ئەم حەوت هەنگاوی دوابەدوای یەکە لە مێشکتاندا بهێڵنەوە. گەر یەکێك لەم هەنگاوانەتان لە بیر بچێت ئەوا مامەڵەکەتان سەر ناگرێت.

١)خستنەڕوو:

یەکەم هەنگاو لەکڕین وفرۆشتندا خستنەڕووە _ دۆزینەوەی کەسانێك کە بتوانن بەرهەمەکانتان یان خزەتگوزاریەکانتان بکڕن لە ماوەیەکی دیاریکراودا.

خستنەڕوو بەتەواوی کاتێك دەست پێ دەکات کە بتوانن بڕیار بدەن کە ئاخۆ ئەو کڕیارە کێیە، تەمەنی چەندە، پیشەی چییە، ئاستی خوێندەواری، پلەوپایەی، وە بونی ئەزموون لە پێشتردا. کۆمپانیاکان ساڵانە پارەیەکی زۆر خەرج دەکەن بۆ ئەوەی ئەو کەسانە بدۆزنەوە. کە لەوانەیە بەرهەم یان خزمەتگوزاریەکانیان لێ بکڕن. پێش ئەوەی کە ئێوە بفرۆشن یان قسەبکەن دەبێت بەتەواوی سادە بن لەگەڵ ئەو بینەرانەی کە دەتانەوێت ڕازیان بکەن.

چوار پێویستیەکە بۆ خستنە ڕوویەکی باش:

بینەر وبیسەر هەر جۆریك بن چوار پێویستی هەیە کە دەبێت گرنگیان پێ بدرێت لە لایەن ئێوەوە.

یەکەم، کڕیار دەبێت دەردێکی هەبێت کە خراپتر نەکرابێت. دەبێت هەستی قایل کردن یان بونی بوارێکی نائاسودەی کە ببێتە هۆی سەرقاڵ کردن وخەمبار کردنیان پێش ئەوەی دەست بکەن بە مامەڵە، دەبێت بزانن کە ئەو بەرهەمەتان چی ئازارێك چارەسەر دەکات و لادەبات.

دووەم، کڕیار کەسێکە کە "کێشەی هەیە کە چارەسەر نەکرابێت هەندێ کات کێشەکە سادەیەو دەردەکەوێت، هەندێك کاتێش ئاڵۆزەو دەرناکەوێت لەهەندێ بواریشدا بوونی نییە. لەهەمان کاتدا ئێوە دەبێت ئەو کێشەیە دیاری بکەن کە بەرهەمەکانتان دەتوانن بە شێوازێکی باش کێشەکەیان چارەسەر بکەن.

سێیەم، کڕیار "پێویستی " هەیە کە هێشتا نەسەلمێنراوە ئەوان هەندێ پێشکەوتنیان دەوێت لە ژیانیاندا کە بەرهەمەکانی ئێوە توانای هێنانەدی

هەبێت ئەو پێویستانە چیبیە کە بەرهەمەکانتان یان خزمەتگوزاریەکانتان دەیدەن.

چوارەم، کڕیار کەسێکە کە" ئامانجی" هەیە. کە هێشتا بەدی نەهاتوە بۆی ئەرکی ئێوە دیاریکردنی ئەو ئامانجە یان پێشکەوتنەیە کە بەرهەمەکەتان لەماوەیەکی دیاریکراو وبەنرخێکی گونجاوو ماوەیەکی دیاریکراو توانای هێنانەدی هەبێت.

کڕیارو گریمانە:

لەکاتی مامەڵە کردن لەگەڵ کڕیارێکدا یەکەم شت کە دەبێت بیکەن جیاکردنەوەی ئەگەرو گومانەکانە، پێویست پرسیار بکەن بۆ دیاریکردنی ئازارەکان، کێشەکان، پێویستیەکان، ئامانجەکانی کڕیار کە بەرهەمەکەتان یان خزمەتگوزاریەکانتان کە دەتوانێت کەمی بکاتەوە یان لای بدات. یاساکە ئەمەیە "پێویستی نەبێت فرۆشتن نییە"بەلأم تەنانەت لە خستنەڕوویەکی فرۆشدا وەکو ((یەکتر بینینی بازگانی، سیمیناری کۆمپانیاکان، کۆبونەوەیەکی گەورە)) دەبێت وتارەکانتان بە پێی چوار پێویستیەکە بێت.

وە پێش بینی دەکرێت ئێوە ئەم وتانەتان هەبێت بۆ کێشەکان.

کێشەکان بەڕوونی لە سەرتادا باس بکەن یەکێك لەبەناوبانگترین ڕێگاکان بۆ کردنەوەی گفتوگۆ ئەوەیە کە لەو شوێنەوە قسە بکەیت کە بەهۆیەوە ئامانجەکانتان بگەیەنن لەبارەی بەرهەمەکانتان یان ئەزمون و خزمەتگوزاریەکانتان وەك ئەم دەقە:

"بەپێی کۆمپانیاکانی دڵنیای، لەهەر سەد کەسێك کە ئیش دەکەن، لەتەمەنی ٦٥ ساڵیدا ١٪ دەبنە دەوڵەمەند، ٤٪ یان خانەدان دەبن، ١٥٪

یان پارەی پاشەکەوتیان دەبێت، ٨٠٪ کەی تریان دەمرن، یان مایە پوچی دەبن یان خانەنشینیان دەبێت یان هەر بەردەوام دەبن لە ئیش کردن. بۆ نمونە:

لەو دوو خولەکەی داهاتودا ئەوەتان بۆ دەردەخەم کە چۆن یەکێک دەبن لەو ٥٪ و ئیتر نیگرانی پارە نابن".

٢)دروستکردنی لێك تێگەشتن و متمانە:

لێکتێگەشتن دروست بکەن بەپرسیارکردنی باش لە کڕیارەکەتان لەبارەی ژیانی کەسی وبازرگانی و بەجوانی گوێ لە وەڵامەکانیان بگرن. ئێوە متمانە دروست دەکەن بەشێوەیەکی کاریگەر بە هۆی ڕونکردنەوەی ئەو سودانەی کە بەرهەمەکانتان هەیانبووە بۆ کەسانی تر لەهەمان حاڵەتدا پرسیار کردن گرنگە بۆ لێکتێگەشتن. بەهۆی پرسیاری کراوەوە، پرسیاری ڕاستگۆیانە، ئێوە دەتوانن ئەوە بدۆزنەوە کە کڕیارەکان چۆن بیرتان لێ دەکەنەوە. گوێ گرتن متمانە دروست دەکات. بەگوێ گرتنی زیاتر بۆ ئەو کەسەی کە پرسیارتان لێ دەکات ئێوە زیاتر خۆشەویست دەکات لای ئەو وە متمانەی پێتان زیاتر دەکات وە کراوەتر دەبێت بۆتان. کڕیار حەزی لە چییە؟

گروپی نەتەوەی بەڕێوبردنی فرۆشیاری. کەبە هەزاران دەوڵەمەندی دروست کردووە وئەوانیش بە بلیۆن دۆلار پارە خەرج دەکەن لە بەرهەمەکانیاندا، کۆمپانیاکانیاندا. ئەم گروپە هەموو ساڵێك ڕاپرسیەك لەنێوان ئەندامەکانید دەکات، دوو پرسیاریان لێ دەکات. ڕاتان چیییە بەرامبەر بە ئەو کەسانەی کە سەردانتان دەکەن؟ چی شتێکی ئەو کڕیارەتان بەدڵە؟ ساڵ بەدوای ساڵ وەڵامەکان دەبنە یەك، فرۆشیارە

شارەزاکان دەڵێن ئەوان حەزیان لەو کەسانەیە کە پرسیاری باش دەکەن. بەوردی گوێ بۆ وەڵامەکانیان دەگرن. وە هەوڵ دەدەن ئەو کڕینە بڕیارێکی باش بێت بۆیان، ئەمەش هەمان وەڵامی ئاسایە کە پیاوە فرۆشیارەکان ساڵ بە ساڵ لێی نزیک دەبنەوە "زۆربەی ئەوانەی دێن قسەدەکەن لەسەر بەرهەمەکان وخزمەتگوزاریەکانیان هەرگیز پرسیارم لێ ناکەن وگوێ ناگرن کاتێك هەوڵ دەدەم ئەوەی پێویستمە پێیان بڵێم"

گوێ لە کڕیارەکان بگرن گوێ گرتن گومان وخەمەکان ون دەکات و وردە وردە ترسەکانی کەس یان گروپەکان کەم دەکاتەوە. وە دڵنیای زیاتر دەکات.

کاتێك دەبنە گوێ گرێکی باش خەڵك حەزیان لێتان دەبێت، متمانەتان پێ دەکەن، دەکڕینەوە لەگەڵتان، وە بەرهەم وخزمەتگوزاریەکانتان دەکڕن. گوتن فرۆشتن نییە. تەنها کاتێك پرسیار دەکەن، ئەو هیچی زیرەکەکی ناوێت کە زۆر بڵێی لەسەر بەرهەمەکەتان بکەن، بەڵکو ئەوە زۆرباشە بۆ بەرهەم وخزمەتگوزاریەکانتان و وەلە کڕیار دەکات بیر لە کڕینیان بکاتەوە.

## دەربڕینی گرێ وەك پرسیارکردن:

لەبری ئەوەی بڵێیت ئەم ئامێری کۆپی کردنە لەهەر خولەکێکدا ٣٢ لاپەڕە کۆپی دەکات بڵێ: ئایا دەزانیت ئەم ئامێرە لەهەر خولەکێکدا چەند لاپەڕ کۆپی دەکات؟ لەوانەیە سەرسوڕهێنەر بێت بۆ ئێوە کە بڵێم ١٨ دانە کۆپی دەکات، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم ئامێرە تەکنۆلۆژیای پێشکەوتوی تێدا بەکارهاتووە. لەڕاستیدا ٣٢ دانە کۆپی دەکات لەهەر خولەکێکدا کاتێك هەندێك زانیاری پێشکەشە دەکەیت دوای ئەوەی

پرسیار دەکەیت زۆر بەهێزترە لەوەی کەزانیاریەکی کەم بدەیت لەسەری.
کاتێك کەقسەدەکەم بۆ کۆمەڵێ کەس بەبەردەوامی لەقسەکانمدا پرسیار
دەکەم وچاوەڕوانی وەڵام دەکەم ئەگەر گوێ گرەکانیش وەڵامیان
لانەبوو، ئەوا وایان لێ دەکات جوڵەیەك یان پەشۆکانێك لە بێدەنگیاندا
دروست بکات و وایان لێ دەکات بەشوێن هەر ووشەیەکدا بگەڕێن بۆ
وەڵام. دەیان بەستێتەوە بە بابەتەکەوە، دوای ئەوەی کە وەڵامەکەم پێ
گوتن هەست دەکەن کە شتێکی سەرسوڕهێنەریان بیستوە. گوێ گر
حەزی لەڕێگای پرسیارو وەڵامە لە قسەکردن وپێدانی زانیاریدا.

## جەخت کردن لەسەر پەیوەندی:

سید رۆ لیڤیت، لە قوتابخانەی بازرگانی وتویەتی: "هەموو
فرۆشتنەکانی سەدەی بیست ویەك فرۆشتنی پەیوەندی دەبن" ئەمەش
مانای ئەوەیە کە چۆنیەتی ئەم پەیوەندییە کە دادەمەزرێت لەگەڵ کڕیار
یان یان بینەر فاکتەری گرنگی ڕەخنە گرتنە لە بڕیاردان کە چۆن کاریگەر
وقایل کەر دەبێ ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە هەست وسۆزو بەهاکان
دەشێوێنێت. تا زیاتر خەڵکی خۆشیان بوێت باشتر بڕوات پێ بکەن.
باشتر بەبەرهەم وخزمەتەکەت پێ دەزانن کاتێك کە ئێوەی خۆش ویست.
دەزانێت کە ئێوە چی دەفرۆشن لە کوالیتی بەرز ونرخ وپارەی زۆر وە
زیاتر لە هەڵەو کەمو کورتیەکانت دەبورێت لە بەرهەمەکاندا بەبەراورد
لەگەڵ پێشبڕکێ کاری ئێوەدا. زۆر خۆش ویستنی ئێوە خاڵی بەهێزی
ئێوەیە وە ئەو شتانەی کە دەیڵێت. دەیکەیت جێی خۆی دەگرێت.

## ناساندن پێویستی به وردەکارییه:

یەکەم کاری فرۆشتن بە هەردوو بەشەکەیەوە، بڕیاردان ئەوەیە کەئەمە دەرفەتێکی ڕاستگۆیەو متمانە دامەزراندنە، کەواتە لێ دەکات گفتوگۆیەکی خێرا ئەنجام بدەیت، بەڵام کاتێك ئێوەو کڕیارەکەت ڕازی بن ئەوا ئەو کات کڕیارەکەت متمانەی لا دروست دەبێت دەست بەجێ پێویستی بە بەرهەمەکەت یا خزمەتەکەت دەبێت. نابێت هەرگیز خۆی بە درۆزن دەربخات تەنانەت ئەگەر زۆر لە کڕیارەکانت هەمان پێویستیان هەبێت. نابێت هەرگیز خۆی بەدرۆزن یان فێڵباز خۆی دەربخات کە کڕیارێکی تایبەت کە بەهەمان شێوەیە پێویستی پێ بێت کاتێ کە خەڵکی تر قسەیان بۆ دەکەیت.

## بەکارهێنانی ڕێگای (( دکتۆری فرۆشتن )):

وادابنێن کە ئێوە دکتۆری فرۆشتنن لەکاری فرۆشتندا. ئەگەربچیت بۆ لای دکتۆر لەهەر شوێنێکی تایبەتدا، دکتۆر سێ پرۆسە ئەنجام دەدات لەهەر کاتێکدا: سەرەتا دکتۆر تاقی کردنەوە وشیکاری پەستانی خوێن، لێدانی دڵ وپلەی گەرمی دەکات وە کۆمەڵێك پرسیارتان لێ دەکات لەبارەی تەندروستیتەوە لە ڕابردو وئێستاشدا دوای ئەوەی دکتۆر شیکاری وپرسیارەکانی تەواو کرد دەچێتە سەر قۆناغی دووەم: کە دەستنیشان کردنی ئەزموونەکانە. دکتۆری باش ئەوەیە کە ئەنجامی شیکارییەکان هەڵدەسەنگێنێت، پرسیار دەکات ئەگەر دۆزینەوە وئەنجامەکان ڕێك وەك نیشانەکان بێت. کاتێك ئێوە بەئەنجامی دەست نیشانەکە ڕازی بن دکتۆر دەچێتە قۆناغی سێیەمەوە.

سێیەم. قۆناغی ڕاپۆرتە. ئەگەر دکتۆر ئێوەی بینی ڕاستەوخۆ دەست بەجێ کاریگەری ودەرئەنجامەکانی پەسەند کرد بەبێ شیکاری وبیاریکردنی نەخۆشی ئەمە بە بەد ڕەفتارییەکی تەندروستی ئەژمار دەکرێت.

## ناسینەوەی پێویستی سەرەتای:

وەك پێشتر ئاماژەی پێ کراوە، کاتێك قسە بۆ کۆمەڵێك کەس دەکەیت وە بەشێوەیەکی خۆکاری یان ئۆتۆماتیکی دێت بە خەیاڵتدا کەچی پیویستە بۆ وتن. چی دەفرۆشیت پێش ئەوەی هەرجۆرە شیکاری وتاقی کردنەوەیەك ئەنجام بدەیت، فرۆشتنەکەت پەك خستوە بەشێوەیەکی بەدڕەفتانە. کاتێك کەسەکە ڕازی دەبێت بەوەی کە ئازاری هەیەو دەیەوێت بڕوات ئازارەکە پێویستی بەچارەسەر هەیە. پێویستە کە ڕازی بکات یان ئامانجێك کەبە ویستی خۆی بێت بۆ چیڵە پۆپە ولوتکە. پاشان دەتوانیت بەرهەمەکەت وەك هەڵبژاردەیەکی نمونەی پێشکەش بکەیت بۆ ئەم سەردان کەرو نەخۆشە. ئەگەر پێشتر دەست بکەیت بەباس کردنی بەرهەکەت یان خزمەت گوزاریەکەت، ئەوا لەڕاستیدا سود وقازانجی بەرهەمەکەت لە دەست دەدەیت. سەردانکەرەکە گوێ لە ڕاسپاردنەکانت ناگرێت.

## ٤) دروست کردنی سیمینار:

چوارەم قۆناغی فرۆشتن بۆ بەرهەمەکانت بەڕێگەیەکی قایل کەر وەك هەڵبژاردەیەکی نمونەی بۆ کڕیارەکە هەموو شتێك چاوەڕوان دەکرێت. بەرهەمەکەتان نابێت زۆر باش بێت. تەنها دەبێت باشترین هەڵبژاردن بێت لەم کاتەدا بۆئەوەی کڕیارەکان بتوانن کێشەکەی خۆیان چارەسەر بکەن

ویان بە ئامانجەکەیان بگەن. سیمیناری باش زانیارییەبەدەست هاتوەکان دووبارە دەکاتەوە کاتێك سەرقاڵی ناسینەوەی پێویستیەکانی، دواتر هەنگاو بەهەنگاو نیشانی سەردانکەری بدە، کەچۆن کێشەکان چارەسەر دەکرێن یان ئامانجەکان دێنە دی بە بەرهەم وخزمەتگوزارییەکانت.

سیمینار پێویستیەکی تەواو نییە بۆ قایل کردنی کەسەکە وەك نواندێك، بەلآم باشترە کەنواندن ونیشان دان بە کڕیار کە بەرهەمەکەت هەڵبژاردەیەکی نمونەییە لە چارەسەری کێشەو کەم کردنەوەی ئازار لەماوەی سیمینارەکەدا پرسیار بکە لە کڕیار لەبارەی ئەوشتانەی کەباست کردووە، کە ئایا ئەوەی باست کردووە بەدڵی بووە؟ فرۆشیاری باش ئەوەیە کەدەسکەوتەکانی خۆی بزانێت. وە فرۆشیاری خراپیش ئەوەیە کە پێشبڕکێ بکات لە ناو سیمینارەکەدا، تەنها لەبارەی شت و قازانجەوە قسە بکات وە لە کۆتاییدا بڵێت: (( ئێ ئێوە چی دەڵێن )) ئەگەر کاتی پێویستتان نەدا بە کڕیارەکانتان بۆ هەڵسەنگاندنی زانیارییەکانتان کە پێتان داون، هیچی شتێك هەڵنابژێرێت بەڵکو هەندێك شت دەڵێت وەك: (( باشە شتێکی زۆر جوان و نایابە، با هەندێ لەبارەیەوە بیر بکەمەوە ))کەسەکە لە گوماندا دەمێنێتەوە هەندێ ووشەی وەك. دەمەوێت لەبارەیەوە بیر بکەمەوە یان با لەبارەیەوە بیر بکەمەوە مانای ئەوەیە کە (( خوات لەگەڵ بۆ هەمیشە )).

خەڵك لەمبارەیەوە بیر ناکەنەوە، بەڵکو بەرێزەوە دەڵێن من نازانم چۆن بڕوا بە ئێوە بکەم وەنازانم بۆ دەبێت یان چۆن پێویستە ئەم بەرهەمەی ئێوە لەم کاتەدا بکڕم، بەلآم سوپاس بۆ هاتنتان.

٥) وەلآم دانەوە یان ڕووبەڕو بونەوەی بەرهەڵستیەکان:

قۆناغی پێنجەم لە فرۆشتنی نایاب پرسیاری کڕیار، بەرژەوەندی یان بەرهەڵستییە بەبێ بەرهەڵستی شتێك نییە بەناوی فرۆشتن. بەهۆی ئەو ماوە زۆرە لە ئەزموون کە کڕیار هەیبوە لە رابردوودا. هەمیشە کڕیار کۆمەڵێ پرسیاری زۆرت لێ دەکات لەبارەی نرخ، جۆر، مەرج، جۆریەتی، زەمان، قیست و سودەکانی. لە ئەزمونی مندا ئەو کەسانەی کە زۆرتین پارە دەدەن ئەوانەن کە بیریان کردوەتەوە لە هەموو بەرهەڵستیە لۆژیکیەکان کە کڕیار لەوانەیە بەرچاوی ڕۆشن ببێتەوە، وەڵامی ڕازی کەری دەست بکەوێت بۆ هەر بەرهەڵستیەك. کاتێك کە کڕیار توشی بەرهەڵستییەك بوو ئەوا کەسی فرۆشیار دانی پێدا دەنێت و پشت لە کڕیار دەکات وبەهۆی ئەمەی کە توشی بووە. پاشان باسی دەکات کە چۆن ئەو بەرهەڵستیە بە ئاسانی ئاڵوگۆڕ دەکرێت، وە بۆ ئەمە هۆکارێك نییە بۆ پێشکەوتن. لەلایەکی تریشەوە فرۆشیاری خراپ بەهەمان شێوەیە. کاتێك بەرهەڵستیەك دەبیستێت توڕە دەبێت وە دڵنیا نییە کە چۆن ڕوبەڕووی ببێتەوە، لەئەنجامدا وردە وردە فرۆشتن لە دەست دەدات.

### ٦) کۆتای هێنان بە فرۆشتن:

قۆناغی شەشەم لە فرۆشتندا بریتیە لە کۆتای هێنان بە فرۆشتن. ئەمەش بە پرسیار کردن لە کڕیار دێت بەوەی کە بڕیار بدات لە کڕین. لە گۆلفدا دەڵێن: دەدەیت لە تۆپەکە بەلأم تۆپەکە دەخەیتە ناو چیاڵەکە بۆ پارە. لە فرۆشتندا هەموو شتێك کە کردووتە تا ئێستا بۆ یەکسان کردنەوەی ((لێدان بۆ بینین )) بووە. سەرکەوتنی کۆتای ئێوە بە سور بوونی تەواوت دەبێت بەو توانایەی بۆ یارمەتی دانی کڕیارەکەت دەبێت بۆ زاڵ

بوون بەسەر هەر دڵەڕاوکێ یان گومان و هەروەها باشترین بڕیاری کڕینی پێ بڵێیت.

## بانگهێشت کردن بۆ کڕین:

لەوانەیە سادەترین ڕێگای کۆتای پێ هێنانی هەر فرۆشتنێك ئەم پرسیارە بێت: (( هیچی پرسیارێك یان بابەتێك هەیە کەمن باسم نەکردبێت؟ )) کاتێك کە کڕیار وتی (( نەخێر )) ئێوە بانگێشت نامەی کۆتای پێ هێنان بەکار بێنە بۆ ئەوەی کڕیار بگەیەنینە دواین بڕیار. بڵێ، باشە بۆچی ئەمە هەڵنابژێریت؟ ئەگەر بەرهەمێکت فرۆشت وەك کەلوپەلی ناومالّ، یان خانو ئەوا بڵێن: (( حەزت لەمەیە؟ )) ئەگەر کڕیار وتی ئەمە زۆر جوان و باشە ئێوەش بڵێن: (( باشە، ئەی بۆ نایکڕیت؟ ))

## ڕێنمونی کردن بۆ فرۆشتن:

لەم ڕێگەیەدا ئێوە دەپرسن: (( ئایا پرسیار یان بابەتێك هەبوو کە من وەڵامم نەدابێتەوە؟ ))

کاتێك کڕیار گوتی: (( نەخێر ))، چاوەڕوانی ئەوش بە کە بڵێت (( بەڵێ )) دواتر بڵێ: باشە هەنگاوی دواتر ئەوەیە. . . . . .

باسی چۆنیەتی کارکردن بکەن بۆ ئەو بەرهەمەی کە دەیفرۆشن. بۆنمونە: (( لەوانەیە بڵێیت: بۆ جێ بەجێ کردنی هەنگاوی دواتر پێویستیم بە ئمزای ئێوەیە لەسەر ئەم فۆڕمانەو چیەکێك کە بەبڕی ٢٩٩٥ دۆلار ٠٥ وە دەیگەڕێنمەوە بۆ ئۆفیسی سەرەکی. من ئەوان بۆ کۆمپانیا دەبەم و داواکارییەکان تەواو دەکەم. ئێمە بەرهەمەکانتان تا دوای نیوەڕۆی چیواشەمە بۆ دەنێرین. بەبۆچوونی ئێوە چۆنە؟ ))

## لەکڕیارەکانتان بوێت کەبڕیاری کڕین بدەن:

چەند ساڵێك لەمەوبەر کاتێك کەکارتی داشکاندنی فرۆشتنی ریستۆرانتم دەفرۆشت لەم نوسینگەوە بۆ ئەو نوسینگە. پێشکەش کردنێکی پەرۆشانە ئەنجام دەدا، بەلاّم کاتێك کاتی ئەوە هات کە بگەڕێم بەدوای فرۆشتندا، بەتەواوی وشك دەبوم دوایش بیرم دەکردەوە باشە حەزت لە چیییە ئەنجامی بدەیت؟

وادەردەکەوێت کە هەموو کڕیارێك وای وتبێت: (( باشە )) زۆر باش دەردەکەوێت ڕێگەم بدە بیری لێ بکەمەوە. پەیوەندیم پێوە بکەرەوە دوای چەند هەفتەیەك خەڵکێکی زۆر لەهەمو شارەکەدا بیریان دەکردەوە لە بەرهەمەکەم، بەلاّم هەر تەلەفۆنەکەم زەنگی لێنەدا دووبارە بۆم دەرکەوت کە: ڕێگە بدە کە بیری لێ بکەمەوە وبۆ دواتر پەیوەندیم پێوە ناکاتەوە. ڕستەی موئەدەبانەی کڕیارەکان بەمانای خواحافیزییە.

ڕۆژێکیان شتێکم بۆ دەرکەوت کە کێشەکە نەلە مشتریەکانمدایە نەلە بەرهەمەکەمدا بەڵکو کێشەکە لەخۆم دایە ترسم لە پرسینی کۆتا پرسیار بوو کەدەبوە هۆی دواکەوتنم. لەمەودوا کێشەکەم چارەسەر کردوو نەم هێشت کەبەم شێوەیە بێت. ڕۆژی دواتر بەیانیەکەی، ڕۆشتم بۆ نوسینگەی کڕیارەکەم وبەرهەمەکەی خۆمم خستە پێش چاوی. ئەو سەری بەشێوەی تەئکید کردن ڕاوەشاند. پێکەنی وگوتی: (( زۆر باشە لەوە دەچی. سەیرێکی ئەو دەکەم، بۆچی دووبارە پەیوەندی بەمنەوە ناکەیت؟ )) من هەمو توانایەکی خۆمەوە گوتم: (( من دووبارە پەیوەندیت پێوە ناکەمەوە. )) ئەو بەتوڕەییەوە سەیری منی کردو وتی: ((؟ تۆ چیەیت وت؟)) دووبارەم کردەوە و گوتم:(( من دووبارە

پەیوەندیت پێوە ناکەمەوە. ئێوە هەرشتێك کە بۆ بڕیاردان پێویستە دەزانن. بۆچی بڕیاری کۆتای نادەن؟ ))

دوای ئەو ووشەسیحراویانەی وت کە پیشەی فرۆشتنەکەی گۆڕیم: (( باشە، ئەگەر دواتر پەیوەندی ناکەیتەوە، کەواتە هەر ئێستا بڕیار دەدەم. )) ئەو قەواڵەکەی ئیمزا کردو پارەکەی پێدام. کاتێك لە نوسینگەکەدا هاتمە دەرەوە، واهەستم دەکرد کەلە سەر هەورەکانم.

دەست بەجێ چوومە نوسینگەیەکی ترەوە. لەم نوسینگەشدا بەرهەمەکەم خستە پێش چاو کاتێك کڕیار بەمنی گوت: (( زۆر باشە، لەوەدەچی دواتر پەیوەندیم پێ بکەیتەوە باشتر بێت. )) بەئەوم گوت: (( داوای لێبوردن دەکەم یان بەداخەوە، من دووبارە پەیوەندیت پێوە ناکەمەوە. ئێوە هەمو زانیاریەکانی بڕیاردانتان لەبەردەمدایە. بۆچی هەرئێستا بڕیار نادەن؟ ))وە ئەوبردی، وەهەروەها کڕیاری دواتر وکڕیاری دواتریش بردیان، لەو ساتە بەدواوە هەمو شتێکم فرۆشت کەقسەم دەربارەی دەکرد. لەڕۆژێکدا لەوە زیاترم دەفرۆشت کە پێشتر لە هەفتەیەکدا دەفرۆشت، بۆیە داوام لە کڕیارەکان دەکرد کە بڕیاری کڕین بدەن.

## ئەوان دژی کەسایەتی ئێوە نین:

لەئەنجامدا تێگەشتم کە کێشەی ترس وبێهێزیم کردنی کۆتا پرسیارە. هەندێك کات ترستان لە ڕەتکردنەوە تەنانەت دەبێتە هۆی لەدەستدانی ئەو کڕیارانەی کە زۆر حەزیان لەم بەرهەمەکەیە.

یەکێك لەهۆکارە سەرەکیەکان بۆ سەرکەوتن بەسەر ترسدا گەشتنە بەو ئەنجامەی کە ڕەتکردنەوە کەسی نییەو تایبەت نییە بەیەك کەس. ئەگەر

خەڵك نەیار بن بەئێوەوە یان بەو شتەی کە دەیفرۆشن، هیچی پەیوەندی نییە بە کەسایەتی ئێوەوە وەك مرۆڤێك یان بەچۆنیەتی ئوشتانەی کە دەیفرۆشن یان پێشکەشی دەکەن. پەیوەندی بەوەوە هەیە کە ئەو کەسە لە گۆمەڵگایەکی بازرگانیدا گەورە بووە یان پێگەشتوە. کەئەبێت بەخشینی بازرگانی ڕەتبکاتەوە یان ئەڕوخێت لەبەردەم بڕیاری کڕین دا، ڕەتکردنەوە پەیوەندی بەکەسەوە نییە.

## ٧) دووبارە فرۆشتنەوە وناردنەکان:

حەوتەم هەنگاولە فرۆشتندا وەرگرتنەوەی شتە فرۆشراوەکان وناردنەوەیانە لەکڕیارە قایل بووەکان بۆ دەست کەوتنی ئەم ئامانجەش، دەبێت باش ئاگات لە کڕیارەکانتان بێت دوای فرۆشتن بەتایبەتی و ڕاستەوخۆ دوای ئەوەی کە بڕیاری کڕیاری کڕینیان داوە.

## ڕێگرتن لەپەشیمان بوونەوەی کڕیارەکان:

ئەمە ڕاستەخۆ دوای ئەوەیە کە کڕیارەکە بڕیاری کڕینی داوە کەئەو خەریکە پەشیمان دەبێتەوە وە بڕیارەکەی دەگۆڕیت. دەبێت ئامادە بن بۆ ئەوە. باشترین فرۆشیارو کڕیارەکان بیرێکی گەورە دەکەنەوە کە چۆن ڕەفتار لەگەڵ کڕیار بکەن پاش فرۆشتن. ئەوان بەتەواوی گەشتونەتە ئە بڕیارەی کە کڕیارەکە بەتەواوی ڕازییە نەك تەنها لەبەرهەمەکە بەڵکو لەو خزمەت گوزاریەش کەبەرهەمەکەی پێ گوازراوەتەوە ودانراوە کە کڕیارەکە دووبارە دەیکڕێتەوە وە پێشنیار دەکات بۆ هاوڕێ کانی.

## ئاسانترین و بەقازانجترین فرۆشتن:



١٠ جار ئاسانتره دووباره فرۆشتنەوه بە کریارێکی قایل لە فرۆشتن بە کریارێکی نویّ کە هەرگیز شتی نەکڕیوە پێشتر. ئەوە مانای ئەوەیە کە دەیەکی کات وپارەو نرخ هەوڵدان دەبات بۆ دووبارە فرۆشتنەوه. تا بۆ فرۆشتن بۆ یەکەم جارو دەستپێکردن لەسەرەتاوە ودۆزینەوەی کڕیاری تازە ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە پێشتر متمانەتان پەیدا کردووە لەلای کڕیارە ڕازییەکە.

ناردن لەلایەن کڕیارە ڕازیەکە ١٥ جار ئاسانترە لە فرۆشتن کەلە سەرتاوە دەستپێ بکەیت. ئەمەش مانای ئەوەیە کە پانزە یەکی کات وپارەو هەوڵی دەوێت بۆ فرۆشتنی ناردنەوەیەك هۆیەکەشی ئەوەیە کاتێك کە پەیوەندی بە کەسێکەوە دەکەن کە شتێکتان بۆ ناردووە ئێوە باشتری بۆ دەنێرن. متمانەی ئەو کەسە بەدەست دەهێنن. کڕیارەکە پێشتر متمانەی پێ کردووی باوڕی بە چۆنیەتی ئەو شتە هەیە کەدەیفرۆشن. ئەوەی لەسەر ئێوەیە ئەوەیە کە دەبێت زۆر ڕووت وسادە بن بۆ هەر پێویستی وکێشەیەك کە کڕیارەکە هەیەتی، نیشانی بدەن کەبەرهەم وخزمەتگوزارییەکەت ئەو پێداویستییە پڕ دەکاتەوەو کێشەکە چارەسەر دەکات. داوای فەرمانی تر کەن.

## فرۆشتن بەگروپ: تیمی پێشکەشکار:

زۆرێك خزمەتگوزاری وبەرهەم لەمڕۆدا ئاڵۆزە، زیاتر لە فرۆشتنێکی ئاسایی کە تیایدا پەیوەندی دەکەن بەتاکێکی بڕیاردەرەوە وتاکێکی بڕیاردەر بڕیاری ئەوە دەدات کەبەرهەمەکەتان بکڕیت یان خزمەتگوزارییەکەت، ئێوە زۆر جار دەبێت بەرهەمەکەتان پێشکەشی هەندێك خەڵکی بکەن لەیەك کاتدا.

کاتێك کە دەتانەوێت پێشکەشکاری بن لەتیمێکدا ئەگەر خۆت بەتەنها بیت یان لەگەڵ خەڵکی تردا لە کۆمپانیایەکدا کە ئەمایش بۆ ئەوانی تردەکان، هەندێ هەنگاو هەن کە پێویستە ڕەچاوی بکەن.

## بزانن کەچۆن بڕیاری کڕین دەدەن:

یەکەم جار پێکهاتەی سیاسی کۆمپانیاو ڕێکخراوەکە بدۆزنەوە، چۆن ئەم بڕیارانە دراون؟ چۆن لەڕابردوودا دراون؟ ئەو خاڵە گرنگانە چین کە پێویستە ڕەچاو بکرێن لەکاتی دانی بڕیاری کڕیندا لە ئیشەکەتاندا یان لە پیشەسازی لە بەرهەم وخزەتگوزاریەکەتاندا؟ ڕێك وەکو ئەوەی کە هەر کەسێك ستراتیژیەتی کڕینی هەیە، هەرکۆمپانیایەکیش ستراتیژیەتی کڕینی هەیە. هەندێك جار حەز دەکەن قسە بۆ جۆرەها فرۆشیاری جیاواز بکەن، هەندێك کۆمپانیا دەیانەوێت پەرەیەکی بەرز بە متمانەیان بدەن لەگەڵ فرۆشیارێکی تاکداو دواتر مامەڵە لەگەڵ ئەو فرۆشیارە بکەن. هەندێك جار پێکهاتەی سیاسی بە شێوەیە کە هەندێك خەڵك دەیانەوێت ئەو فرۆشیارە ببینن وهەست بەئارامی بکەن و وامەست بکەن کە ئەو کەسە کەسی شیاوە کە شتی لا بکڕن وپێداویستیەکانی لەلا پڕ بکەنەوە. هەرچیییەك بێت بارودۆخەکە ئەرکی ئێوەیە کە پرسیار بکەیت لە پەیوەندی سەرەتاییەکە کە چۆن ئەم بڕیارە ئەدرێت لە کۆمپانیاکەیدا.

## کەسەکان بناسن:

پێش لەنیشان دانی بەرهەمەکە بۆ گروپێك، ئەو کەسانە کەلە تیمەکەدا هەن بیان ناسن. ناو شوێنی نیشتە جێبونیان بپرسن. تەنانەت وا باشترە کەلەگەڵ یەك بەیەکی ئەندامانی تیمەکەدا قسەبکەن. ولەوان بپرسن کە

چی شتێك لەهەموی بۆیان گرنگترە وە حەز دەكەن لەم كۆڕەدا چی‌بیان دەسكەوێت.لەبیرتان بێت كە ئامادەكاری نیشانەی پێشكەوتوییە، گرنگترین ئامادەی زانینی نیازی ئەو كەسانەیە كە بڕیارە قسەیان لەگەڵدا بكەن. موهیمترین هۆكاری كاریگەر لە بڕیاردانی ئەواندا چی‌یە؟

## دۆزینەوەی ئەوەی كێ بڕیار كۆتای دەدات:

لەهەر بڕیاردانی هەمو گروپە كڕیارەكاندا كەسێك هەیە كە دەتوانێت بڵێت: (( بەڵێ ))وە ئەوانی تریش تەنها بۆیان هەیە نەخێر بڵێن. ئەركی ئێوە بریتیە لەدیاریكردنی بڕیاری كۆتای ( واتە ئەوكەسەی كە دەتوانێت بڕیاری كڕین بدات یاخود هەڵی بوەشێنێتەوە ) هەندێك جار لەوانەیە ئەم كەسە لەپێشەوە بوەستێت وپرسیاری زۆر بكات وە هەندێك جاریش لەوانەیە بەبێ دەنگی دانیشێت ورێگە بەكەسانی تر بدات كە پرسیار بكەن وبەلام دەبێت بزانیت كە دەركردنی بڕیاری كۆتای لە دەستی كێدایە هەروەها تێبینی و لێدوانەكانی خۆتی بۆ بنێریت لە ڕێگای پێشكەش كردنەوە.

## دۆزینەوەی كلیلی سود وەرگرتن:

لەهەموو كارێكی فرۆشتندا، كلیلێك هەیەبۆ سود وەرگرتن كە لە كڕیار بكرێت كەڕازی بكرێت لەسەر ئەوشتەی كە دەیكرێت.

پێویستە لەسەرت كەپێشتر ڕاوێژ لەگەڵ كەسێكی شارەزادا بكەیت. لەكۆمپانیاكاندا پێش ئەوەی بگەیت بە گروپێك لەخەڵك. ئەو شتە چی‌یە لەكۆمپانیاكەدا كەخەڵكی ڕازی دەكات پێش ئەوەی كەبەرهەم یان خزمەتگوزاریەكانت بكرێت؟

## دەرخستنی بەربەستەکان:

پێویستە کە کۆسپ وڕێگرە سەرەتاییەکان بدۆزنەوە بۆ ئەنجام گەیاندنی کرداری فرۆشتن. ئەوهۆکارە چییە کەوادەکات کڕیار پشت لە ئێوە بکات یاخود بەهیچی شێوەیەک شت لە ئێوە نەکڕێت؟

وەلامی ئەم پرسیارە دەکەوێتە سەر پێویستیەکانی ئێستای کڕیارەکەو ئەزموونەکانی ڕابردووی، ئەگەر هاوڕێیەکتان هەبو لەکۆمپانیایەکدا دەتوانن پرسیاری لێ بکەن کە سەرەکیترین بەربەست چییە کەوا لەم بڕیاردانە دەکات کە دوابکەوێت؟ دەبێت وەلامەکان بزانین ئەگەر دەتەوێت فرۆشتنەکە بکەیت، دەبێت بەتەواوی بزانین زۆرترین پێویستیەکان وداواکاریەکانی کڕیارەکە چین وەلە هەمان کاتدا ئەو بەربەستەی دوودلی دەکات وبڕیاری کڕینی پێ دوادەخات، پاشان دەبێت جەخت لەسەر قازانجە گرنگەکە بکەیتەوە، چەند جارێک لە کاتێکدا پیشانی دەدەیت چۆن ترسە سەرەکیەکەو بەربەستەکە لابراون لەکاتی کێشەکەتاندا.

## قسەکردن وەکو فرۆشیارێکی پێشکەوتو:

کاتێک کە نمایش بۆ بینەرێک دەکەن، بەتایبەتی کاتێک کەهەوڵ دەدەن خەلک بەپێی پێشنیارەکانی ئێوە شت بکڕن، بیرلەوە بکەنەوە کە چۆن ئەو حەوت بەشەی پرۆسەی فرۆشتنی پێشکەوت بەکاردەهێنن، ئەوان یارەتیتان دەدەن ڕونیەکی گەورە پەرە پێ بدەن وکاریگەری زیاد دەکات لەپێشکەش کردنەکەتاندا. ئەوە دوپات بکەنەوە کەپێشنیارەکانتان دەتوانێت ئەو ئازارەی کە بینەرەکە هەیەتی نەیهێلێت وە ئەو کێشەیەی کە بینەرەکە هەیەتی چارەسەری دەکات. ئەو پێویستیە دیاری بکەن کە

بینەرەکە هەیەتی وپێشنیارەکانتان دەتوانێت ئەو ئامانجە بەدی بهێنێت و ڕێگە بۆ بەدەست هێنانی خۆش بکات.

## هۆگری ومتمانە دروست بکەن:

لەسەرەتای قسەکانتانەوە هەندێ کات تەرخان بکەن بۆ قسەکردن بۆ بنیاتنانی متمانەو هۆگری، پرسیار لە بینەرەکان بکەن وچاوەڕێی وەڵامیان لێ بکەن، ئایا بەدەنگی بەرز وەڵام بدەنەوە یان بۆ خۆیانی جێ بهێڵیت گەرم وگوڕ بن ودڵخۆش بن بە ئامادەبونی بینەرانتان، ئەم ئیشە هۆگری ومتمانە لەلای خەڵکی دروست دەکات وە واڵە خەڵکی دەکات کە دوای ئەو پەیامە پیرۆزە بکەون.

## نیازەکانیان ڕوون بکەنەوە:

هاوکاری بینەرەکانتان بن لە ڕوون کردنەوەی ئەو نیازانەی کەهەیانە، لەبیرتان بێت زۆرێك لەکڕیارەکان لەسەرەتادا نازانن کە چیەیان پێویستە لەو بەرهەم وخزمەتگوزاریانەی کە ئێوە هەتانە بۆ ئەوەی بیان هێننە دی. تەنیا کاتێك تێ دەگەن کە بەرهەمەکەی ئێوەیان دەوێت یان پێویستیان بەوەیە کە پرسیاریان لێ بکەن.

## بیروبۆچونەکانی خۆتان بەڕونی باس بکەن:

بەرهەم وخزمەتگوزاریەکانتان بە باشترین شێوەی هەڵبژێردراو بۆ بینەرەکانتان پێشکەش بکەن. ئێوە دەتوانن پێشنیاری ئەوە بکەن دوو یان سێ ڕێگای ڕازیکەر یان پێویست هەیە بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان، پاشان نیشانی بدەن کە بەرهەمەکەتان چۆنەو باشترینیان کامەیە بۆ ئەم کۆمەڵەیە.

## بانگەواز بکەن بۆ کارکردن:

لەکۆتای قسەکانتاندا لەبینەرانتان بوێت کە هەندێ هەنگاو جێ بەجێ بکەن. هێندە بدوێن کە نەبێتە هۆی لەبیرکردنی قسەکانی ترتان، تاوەکو وردە وردە کۆتای بە قسەکانتان بهێنن. ئێوە دەبێت بابەتێکی بەهێز باس بکەن ولەخەڵکیتان بوێت ئیشێك بکەن: ئیشێك کە ئەگەر ئامۆژگاریيەکانی ئێوە نەبوایە. نەیان دەتوانی ئەنجامی بدەن. ئەو ئیشەی کە دەتانەوێت ئەنجامی بدەن دەبێت بەتەواوی ڕوونی بکەنەوە، لەگەڵ ئەواندا قسەبکەن وپێیان بڵێن کە ئەگەر بەپێی ئامۆژگارييەکانی ئێوە ئیش بکەن ئەوا سەرکەوتو دەبن.

وەك کۆتا باس دەبێت بڵێم: گۆڕانی خەڵکی تەنها لەبەر ئەم هۆکارەیە کە رابیردەکەنەو دوای گۆڕانی هەموو شتێك باشتر دەبن. لەبەر ئەمە لەکۆتای گفتوگۆکەی خۆتاندا دەبێت سور بن لەسەر ئەم خاڵە کەتەنها بەپێی ئامۆژگاریەکانی ئێوە ئیش بکەن، شتانێکی باشتر بەدەست دێنن.

## پوختە:

هەمو گفتوگۆیەك شێوەیەکە لە فرۆشتن. وەکو هەلێکی قسەکردنی گشتیە، هەرفرۆشتنێکی وتارێك هەڵمەتێمکە بۆ قایل کردنی خەڵك بەهەڵسوکەوت کردن بەشێوەیەکی جیاواز لەوەی کە لەغیابی قسەکردنی ئێوەدا هەیە. کاتێك ئێوە لێزان دەبن لەهونەری فرۆشتنی وتار، زۆر باش دەبیت لەوەی کە ببیتە باشترین یەکێك لەو باشترینانەی بەڕێژەی ١٠٪ وەك فرۆشیارێك لەبوارەکە خۆتدا.

بڵاوكراوەكانی #سایە ٢٠١٨

| | |
|---|---|
| سەعدی شیرازی/ ئوستادی پەیڤ | عیرفانی |
| سلاّوله خۆم / جاك كانفیلّد | دەروونزانی |
| یاساكانی ژیان / ریچارد تێمپلار | دەوونزانی |
| منداڵی دەوڵەمەند منالّی زیرەك / رۆبێرت كیۆساكی | دەروونزانی |
| چۆن لەگەڵ خەلكی گفتوگۆ بكەین / لیل لۆندز | دەروونزانی |
| شەوێك لەگەڵ خۆردا / شەمس / | عیرفانی |
| پەروانە / | عیرفانی |

**كتێبەكانی #سایە بۆ ماڵی خێزانی كورد**



# SPEAK TO WIN
## BRIAN TRACY

*هـونـەری وتـاربیـژی و هـونـەری نوسیـن.

*پـلان دانـان و پێکـهێنـان بـە زمـانێـکی سـادە.

*باوڕبەخۆبون و زاڵ بـوون بـەسـەر مێشکدا.

*لـە بـەرامبـەر هـەموو بیسـەراندا بـەهێز بێنـە پێش چاو.

*زاڵ بـوون بـەسـەر کۆڕ و کۆمـەڵـە بچوکـەکـانـدا.

*فـرت وفـێڵی بـازرگـانی: شێوازەکـانی مـامۆسـتا وتـاربێژەکـان.

*کۆنتـڕۆڵ کـردنـی نـاوچـەی تـایبـەت بـەئێوە.

*لێدانی کۆتـای بوەشێنن :هـەنـاسـەیـان بگـرن.

## بۆ بردنەوە قسە بکەن

یاساکانی وتاربێژی







